٣٨١

دوو

# چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی

لەگەڵ بەریزان

## د. عیسمەت شەریف وانلی



و



## د. ئیسماعیل بیشکچی

هێنانە سەرشێوەی کرمانجی خواروو و وەرگێڕانی
لە عەرەبییەوە:
مەهاباد کوردی

چاپخانەی وڵات

# دوو
# چاوپێکەوتنی رۆژنامەنووسی

## لەگەڵ بەرێزان

# د. عیسمەت شەریف وانلی
# و
# د. ئیسماعیل بێشکچی

هێنانە سەرشێوەی کرمانجی خواروو و وەرگێڕانی
لە عەرەبییەوە:
مەهاباد کوردی

Weşanên Rewşen 15

# گفتوگۆی
# رۆژنامەی بەرخۆدان
# لەگەڵ
# عیسمەت شەریف وانلی*

بەرخۆدان: پێش هەرشتێک ئێمە بەناوی رۆژنامەی بەرخۆدان زۆر سوپاسی ئێوەدەکەین بۆ رەخساندنی کاتی خۆتان لەگەڵ ئێمە. هیواداریـن لەم گفتوگۆیەدا بتوانین چەند تێروانین و بیروباوەڕی تۆ بگەیەنینە خوێنەران. لەلایەکی ترەوە تاکو بتوانین مەسەلەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان، کە ئێستا بەشێوەیەکی نوێ رابەری دەکرێ بهێنینە ئاراوە. جا لێرەدا پێش ئەوەی دەرگای ئەم چاوپێکەوتنە والا بکەین هیواداریـن، خۆتان، بە خوێنەران بناسێنن.

وانلی: من زۆر حەزناکەم، لەسەرخۆم بدوێم. بەڵام چونکە ئێوە لەمنتان داواکرد، ئەوا ناچارم گەر بە کورتیش بێ لاپەڕەی ژیانی خۆم ئاوالا بکەم. من لە ١٩٢٤/١١/٢١ لە گەڕەکی کوردان لە شاری شام ـ دیمشق ـ لە دایک و باوکێکی کورد لەدایک بوومە. ناوی باوکم محەمەد شەریف وانلییە لە مێژەوە کۆچی کردبووە شاری دیمشقی

* ئەم چاوپێکەوتنە بە کوردی (کرمانجی) لە ژمارە: ١١٤ی رۆژنامەی (بەرخۆدان) بڵاوکراوەتەوە.

پایتەختی سوریا. دایکیشم خەیرییە عەبدوڵلا عەلەرشی بوو. بنەماڵەی ئەویش لە دیاربەکرەوە کۆچیان کردبوو بۆ شام. پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی‌و دواناوەندی بە زمانی عەرەبی‌و فەرەنسی ڕووم کردە لوبنان. ساڵو نیوێک لە زانکۆی بەیروت لقی ئەندازیاریم خوێند. بەلاّم لەم خوێندنەدا سەرنەکەوتم، چونکە من خۆشم ئامادەییم بۆ ئەم کارە نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ چوومە سویسرا. لەپێش منیش برادەر نورەدین زازا خۆی گەیاندبووە زانکۆی لۆزان. نورەدین زازا بووە هۆیەکی یارمەتیدەرو سەرەکی تاکو من لە لۆزان قەبوڵ بکەن. هەڵبەتە (پەیمانانامەی لۆزان) بووە هۆی ژێرپێ خستنی مافەکانی گەلی کورد. لە سویسرا بڕوانامەی (پارێزەری)م وەرگرت. لەلایەکی تریشەوە هەر پلەی دکتۆرام لە سیاسەت‌و پلەی ماستەرم لە مێژوو لە دانیشگای (ژنێڤ) بەدەست هێنا. گەلێک ساڵیش لە زانکۆی سۆربۆن (پاریس) بابەتی (شارستانیەتی کوردستان)م خوێند. ئەم کارەش بە پێشنیاری کامەران بەدرخان بوو کە لەوێ زمانی کوردی دەووتەوە. جا لەبەر ئەوە فەرەنسا تاکە دەوڵەت بوو، کە لەیەکێ لە زانکۆکانی‌دا مێژووی کوردستان دەخوێنرا. ئەمەش لە ساڵی ١٩٥٩دا بوو. پێش ئەم ساڵەش ١٩٥٩ ئێمە (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)مان پێک هێنا بوو، واتا دوای کۆنگرەی ساڵی ١٩٥٦ کە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەسترا بوو. ئەم کۆمەڵەیەی ئێمە لە ١٩ کەس پێک هاتبوو. هەندێک لە خوێندکارانی عێراقی سەر بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە نێو ئێمەدا هەبوون‌و دەیان ووت: (پێویست نەبوو ئێوە ئەم کۆمەڵەیەتان ساز بکردایە، چونکە پێشتر ڕێکخراوەی خوێندکارانی عێراقی هەبووە. ئەمیش هەر بۆ کورد هەوڵ دەدات. هەروەها کۆمەڵەی ئێرانی یا تورکی هەنە. ئەوەندە بەس نییە؟ ئەوانیش بۆ ئێوە کاردەکەن...) شتی پێویست ئەمە بوو: ئێمە گوێمان لەوان نەگرت‌و

کۆمەڵەی خۆمانمان دامەزراند. لەو کاتانەدا من لە گەلێک کۆنگرەی گشتی جیهانی بەرپرسیاری کۆمەڵە بووم. لە ساڵی ١٩٥٨ من هەڵبژێردرام‌و ئامادەی کۆنگرەی لەندەنیش بووم. لەم کۆنگرەیەشدا گەلێک دەوڵەتی گەورە بەشدار بوون. دوای ئەمە گەلێ جار من بە ناوی کۆمەڵەی خۆمانەوە بوومەتە ئەندامی کارگێڕ لە یەکێتی خوێندکارانی جیهان. زۆر جار مقۆ مقۆی دژوار لە نێوان ئێمەو خوێندکارانی عێراقی دەهاتە کایەوە. ئەوان لەدژی وەرگرتنی ئێمە لەنێو یەکێتی خوێندکارانی جیهان ڕادەوەستان. لەم کۆنگرەیەدا من پەیوەندی نێوان بەندی (ماددەی) دووەم‌و سێیەمی دەستووری عێراقم باس کرد. بەندی سێیەم دەڵێت:( میللەتی کوردو میللەتی عەرەب بەشدارن لە نیشتمان هاوبەشن.) بەلاّم بەندی دووەم دەڵێت:( عێراق پارچەیەکە لە نیشتمانی عەرەب‌و ئەو میللەتانەی تێیدا دەژین پارچەیەکن لە میللەتی عەرەب.) منیش ئەوەم پەسند نەکردو گوتم: (جیاوازییەک لە نێوان بەندی دووەمین‌و سێیەمین‌دا هەیە.) ئەمە چۆن بوو؟ من ووتم: (ئەگەر ئێوە مافی کورد ڕەوا دەبینن، ئەوا پێویستە بزانن کە کورد عەرەب نییە کەواتە تەنیا عێراقی عەرەبی پارچەیەکە لە دەوڵەتانی عەرەب. گەلی کورد نە عەرەبە، وولاّتی ئەو عێراق نییە، وولاّتی ئەو کوردستانە. کوردستانیش لەژێر دەستی چوار دەوڵەتدا دابەشکراوە.) بەڕاستی گفتوگۆیەکی دژوارو تیژ لەنێوان ئێمەو یەکێتی خوێندکارانی عێراق پێکهات کە ئەندامانی ئەو یەکێتییە سەربە پارتی کۆمۆنیستی عێراقی بوون. ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی بڕیارێک لە لایەن حکومەتی عێراقەوە دەربچێت: پێویستە لە ماوەی دوو کاتژمێردا عێراق جێ‌بهێڵم، گەرچی من میوانیش بووم، بەتایبەتی میوانی مەلا مستەفا بارزانی لە باژێری بەغدا. ئەو لەوێ دەما. من پێم ووت: (حاڵو مەسەلەی من بەم جۆرەیەو دەمەوێ بچمە کوردستان.) زۆر بەپەلە نووسینگەی سیاسی

پارتی دیموکراتی کوردستان کۆبوونەوەیەکیان پێکهێناو بە منیان ووت: (ئەگەر تۆ گەشت بکەی بۆ کوردستان پێویستە ئێمە تۆ لە پۆلیسی عێراقی بپارێزین. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە شەڕێکی گەورە لە نێوان ئێمەو دەوڵەتی عێراقدا بەرپا دەبێت. ئێمەش ئامادەی ئەم کارە نین.) لەبەر ئەم هۆیە من گەڕامەوە سویسرا. بەڵام هەرکە شۆڕش دەستی پێکرد گەلێ جار چوومە کوردستان. من بە کورتی هەر دەتوانم ئەم ووتانەتان بۆ باس بکەم.

بەرخۆدان: وەک ئاشکرایە لەم کاتەدا بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان بەشێوەیەکی هاوچەرخ بەرێوە دەبردرێت. ئەم بزووتنەوەیەش، هەر لە سەرەتای ۱۹۷۰ەوە لەژێر رێبەرایەتی پارتیا کارکەرێن کوردستان ـ PKK بەرێوەدەبردرێت، لەسەر بنچینەی زانستی رێکوپێک، بۆ ئامانجی سەرەکی واتا سەربەخۆ بوون و ئازادی کوردستان کاروانی خەبات بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت. لێرەدا دەمانەوێ بپرسین، ئایا ئێوە ئەم بزووتنەوەیە کە لەژێر سەرکردایەتی PKKەوە بەرێوە دەچێت، بە تایبەتی لە باکوری رۆژئاوای کوردستان (کوردستانی باکور) رۆژ بە رۆژ شەڕ گەرمتر دەبێ و دەبێتە شەڕی گەل، چۆن ئەم بارە هەڵدەسەنگێنن؟

وانلی: پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، گەر بە کورتیش بێ، دەمەوێ باسی لاپەڕەیەکی‌تری ژیانی خۆم بۆ ئێوە بکەم. من لە ساڵی ۱۹٦۲ بەرپرسیاری شۆڕشی باشووری کوردستان بووم لە دەرەوەی وڵات. من بە ناوی بارزانی دەدوام. ئەم لێپرسراوێتییەم تا ساڵی ۱۹٦٦، پاشان لە ساڵی ۱۹۷٥ تا ساڵی ۱۹۷٦ ئەنجامدا. بەڵام لە راستیدا هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ئامانجی شۆڕشدا نەبووم. من ئۆتۆنۆمی (خودموختاری)و ئەو دیموکراتیەی کە دەیان ووت، پەسندم نەدەکرد. بەڵام هەر چۆنێک بێ، چونکە من ووتەبێژی بارزانی بووم،

پێویست بوو، بۆ شۆڕش کارم بکردایە.

من گەلێک جار بە مەلا مستەفا بارزانیم ووت، کە ئامانجی شۆڕش واتا ئۆتۆنۆمی بگۆڕدرێت‌و لە شوێنی عێراقێکی دیموکرات بێتە عێراقێکی فیدرالی، یاخود لە تەنیشت کۆماری عێراقی عەرەبیدا یا کۆماری باشووری کوردستانیش هەبێت. ئەو پێشنیارەشم لە پەرتووکی خۆم لەژێر ناوی (شۆڕشی کوردستانی عێراق) لە سالی ۱۹٦۹ بلاوکردەوە. هەر ئەم پێشنیارەش بابەتی من بوو بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە سیاسەت. لەم پێشنیارەی خۆمدا ئەوەم باسکردووە کە: (پێویستە میللەتی کورد مافی چارەنووسی خۆی بە دەستی خۆی بەدەست بهێنێت‌و بڕیاری لەسەر بدات... چونکە نەتەوەیەکەو داگیرکەران پارچە پارچەیان کردووە. ئەو داگیرکەرانەی کە کوردستانیان خستۆتە ژێر چنگی خۆیان، تایبەتینە نە لە شێوەی کلاسیکی یا هێزدارن! ئەو هێزانەی کە کوردستانیان داگیر کردووە، دراوسێی گەلی کوردن‌و لەگەلی کوردیش پێشکەوتووتر نین. ئەوانیش لە جیهانی سێیەمن.) لەو کاتەدا من لە دەرهەقی ئەمە نموونەیەکیشم هێناوەتەوەو گوتوومە: (فەرەنسا بزخۆی جەزائیری کردە کۆلۆنی، بەلام پاش ئەوەی کە لە جەزائیر کشایەوە گەلێ بازنەو زانینگەی قەشەنگی لە شوێن خۆی جێهێشت. داگیرکەرانی کوردستان هیچ شتێکی وایان نەکردووە. ئامانجی یەکەمینی ئەوان ئەوەیە کە تەفگەری کوردی بفەوتێنن‌و هەرچی باشە نەیهێلن.) هەلبەتە لەسەرەتاشەوە باوەڕم ئەوەبوو کە داگیرکەرانی کوردستان هەرە خراپترین‌و دڕندەترینن.

لێرەدا دەگەڕێمەوە سەر پرسیارەکەی ئێوەو وەلامیشتان دەدەمەوە. پێش هەموو شتێک دەمەوێ هەلوەستەیەک بکەم لەسەر ڕێی ئامانجی شۆڕشی باکووری کوردستان‌و لەبن سەرکردایەتی پارتیا کارکەرێن کوردستان ـ PKK‌و سەرهەلدان‌و ڕاپەڕین لەژێر باسکی ئەنیا ڕزگاریا

نەتەوا کوردستان ـ ERNK. بێ هیچ شک‌و گومانێک ئەم شۆڕشە لە سەدا سەد بۆ ئامانجی ڕاستەقینەو ئاشکرا بەرپا بووە. بەڕاستی سەربەخۆ بوون‌و ئازادی ئامانجی هەرە گرنگ‌و پێویستترینی گەلی کوردو کوردستانن. ئەم شۆڕشە، هەر بە یەکجار لە شۆڕشەکانی باشوورو ڕۆژهەلاتی کوردستان، کە لەسالی ١٩٤٥ بەرپا کراون، جوداترە.

ئامانجی ئەو شۆڕشانەی کە لە سەدەی ١٩دا بەرپا بوون، هەتا دەگاتە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانیش، سەربەخۆبوونی کوردستان‌و ئازادی گەلی کوردستان بووە. هەر هەمان ئامانج، لە سالی ١٩٤٥ەوە، هاتە گۆڕاندن. لەپاشان یەکێتی سۆڤیەت کەوتە باکووری ئێران‌و ئینگلیزەکانیش کەوتنە باشووری ئێرانەوە. لە لایەکەوە دەیانویست چەک‌و خواردەمەنی بە ئاسانی بنێرنە یەکێتی سۆڤیەت، لەلایەکی تریشەوە، دەیانویست ئێران لە سیخوڕو نۆکەرانی نازییەکان پاک بکەنەوە. لەو دەمەدا تێکەلی لە نێوان ئازەرییەکان‌و یەکێتی سۆڤیەت پێکهات‌و بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمارێکی دیموکراتی لە ئازەربایجان. گەلی کوردیش، لەسەر بناغەی ئەوەی کە لە ئێراندا ئۆتۆنۆمی بخوازێت، هەستا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان (کۆماری مەهاباد)ی دامەزراند. بە تێڕوانینی من، ئەو شۆڕشانەی کە بەرپابوون‌و کۆماری مەهابادیش نەیخواست‌و ئامانجی یەکێتی سۆڤیەت بوون. بۆچی؟ چونکە تێکەلی بازرگانی‌و کۆنەشانیی یەکێتی سۆڤیەت لەگەل تورکیا، عێراق‌و ئێراندا هەبوو. هیچ جارێک یەکێتی سۆڤیەت نەیدەویست ئەو پەیوەندییانەی خۆی لەبەر خاتری مافی گەلی کورد خراپ بکات. بەلام هەندێک جار دەیویست بەرێگای پارتە کۆمۆنیستییەکانی ناوچە، وەک پارتی کۆمۆنیستی عێراق‌و پارتی کۆمۆنیستی ئێران (تودە)، هاریکاری ئۆتۆنۆمی کوردان بکات. بە

بیروباوەڕی من، داخوازی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد، چارەیەکی نیوەچڵە. بەرژەوەندییەکانی بۆرژوای کورد بە عەرەب، فارس‌و تورک دەپارێزێت. بەڕاستی ئەم ئامانجە بە خۆشی داخوازییەکی بۆرژوایانەیەو شۆڕشگێڕی نییە. داخوازی گەلی کورد نییە. لەم بوارەدا ئەزموونی تایبەتی من هەنە. کاتێ بەسەردان دەچووومە باشووری کوردستان، پێشمەرگە لە منیان دەپرسی : (ئایا ئالای ئێمەو پاسەپۆرتی تایبەتیمان دەبێت؟) منیش وەڵامی ئەوانم دەداوەو دەمووت: (من باوەڕ ناکەم، چونکە ئێوە ئۆتۆنۆمی لە ناوخۆی کۆماری عێراق داوا دەکەن.) دەیان ووت: (کەواتە بۆچی شەڕ دەکەین؟) بەڕاستی گەل دەیووت بۆ سەربەخۆبوونی کوردستان شەڕدەکەین. ڕاستییان نەدەزانی. گەر تۆ ڕاستیش بزانی، دروشمی میللی شۆڕش: (یان کوردستان یان نەمان!) بوو. ئەمە مانای چ دەگەیەنێت؟ مانای ڕزگارکردنی کوردستان دەگەیەنێت. ئەم دروشمە، گەلی کوردی لەچوار دەورەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کۆکردبۆوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی ڕەسمی‌و بنکەیی شۆڕش، ئۆتۆنۆمی بوو بۆ کوردستان لەنێو خۆی کۆماری عێراق. من دەمویست ئەمەش بە کورتی ئاشکرا بکەم.

دیسان دەگەڕێینەوە سەر شۆڕش، کە لەبن ڕێبەرایەتی PKKدا بەرپا بووە. دروشمی شۆڕشی ڕاست‌و ئاشکرانە... ئەمە لەلایەکی تریشەوە شۆڕشێکی میللییە. گشت چین‌و توێژێکی گەل لەنێو شۆڕشدا جێی خۆیان گرتووە. کرێکار، جوتیار، ڕۆشنبیر، ژن، زارۆک... هەرکەسێک ڕۆڵی خۆی لە شۆڕشدا هەیە. هەروەها سەرۆکایەتی PKKش لە گەلەوە بۆ گەلە. جاری یەکەمینە، کە لە مێژووی هاوچەرخی بزووتنەوەی کورددا، دەبینە خاوەنی شۆڕشێکی میللی. بە ناوەڕۆکێکی نەتەوەیی پتەو، هەر کەسێک بۆی هەیە جێی خۆی لە شۆڕشدا بکاتەوە...و ئامانجی بنکەیی ئەم شۆڕشەش سەربەخۆبوون‌و

ئازادی کوردستانه. لەلایەکی‌تر، ئێمە چمان دەوێت؟ ئەمەی بۆ ئێمە وەک خەونێک بوو. ئێستاش، ئەو خەونەی کە باوەڕمان پێ نەدەکرد بێتە دی، هاتۆتەدی‌و بووەتە هیوای گەلی کورد. لەلایەکی‌ترەوە ئەوانە کە بوونەتە هێمای ئەم شۆڕشە کارکەرو جوتیاری کوردستانن. شۆڕش بەخۆشی لەسەر بنکەو ڕێکخراوەیەکی بەهێز دامەزراوە. من بە چاوی خۆم دەبینم کە ئەندامانی PKK، سەروماڵیان پێشکەشی گەلی کورد کردووە. بەڕاستی ئەندام‌و لایەنگرانی ئەم پارتە، زۆر پشوو فراوان، ژیر، زاناو بلیمەت...و تا هەتا هەتاییش بە ئامانجی گەلی کوردەوە گرێدراون: دەربارەی چارەنووسی جیهان‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەلێ ئاگادارن. لێرەدا مرۆڤ دەتوانێت بێژێت، کە ئیتر گەلی کورد لە سایەی PKK، خەباتگێڕانی خۆی بە خۆی پەیدا دەکات.

بە بڕوای من شتێکی تر هەیە، کە گەلێک پێویستە. ئەمە چییە؟ لەم شۆڕشەدا گەلی کورد، پشت بە هێزی خۆی دەبەستێت. چۆن؟ هەروەک دەوترێ، لە هەموو شۆڕشێکی نەتەوەیی‌دا هێزو توانای ئابووری دەماری ژیانە. بێ توانای ئابووری، شۆڕشەکان ناگەنە ئامانجی پێکراوی خۆیان. لەم شۆڕشەشدا، ئەمە جاری یەکەمینە کە پارەو دارایی لە گەلی کورد خۆیەوە دێت بۆ شۆڕش. شۆڕش، بە هێزی کرێکاران‌و جوتیاران، هەنگاوی خۆی بەرەو پێشەوە هاویشتووە... نەوەک شۆڕشەکانی ڕابردوو، کە بەداخەوە پشتیان دەبەست بە هێزی دەرەوەو بیانی‌و غەیرە کورد. ئێمە نامانەوێ لەم بوارەدا قسەی خۆمان درێژ بکەینەوە بەڵام با بزانین کاتێ کە ئێران هاریکاری کوردی باشوور (عێراقی) دەکردو عێراقیش هاریکاری کوردی ڕۆژهەڵات (ئێرانی) دەکرد، ئەمە لە سەدا سەد، نە بە مەبەستی سەرکەوتنی گەلی کورد بوون. هەر لەبەر ئەمە بوو، شۆڕش تێکچوو و هەڵوەشا... هێزی سەرەکی شۆڕشیش لە دەوڵەتانی بیانییەوە دەهات. من هەر بەجارێک

باوەڕ ناکەم، کە ئەم تێکچوونو بنکەوتنە، لە شۆڕشی ژێر سەرکردایەتی PKKدا بێتەکایەوە. چونکە هێزو پشتی پێشمەینی ئەم شۆڕشە گەلی کورد خۆیەتی. ئەمەش شتێکی زۆر گرنگو پێویستە. بە کورتی ئەنجامی ئەم شۆڕشە سەرکەوتنێکی پیرۆزە. شتێکیتریش هەیە، کە پێویستە باسی لێوە بکەم: PKK ڕاستیی یەکێتی گەلی کوردو کوردستانی هێنا ئاراوە. ئێستا چ جودابوونێک لە نێوان کوردی باکووری ــ ڕۆژئاوای کوردستان (تورکیا)، کوردی باشووری ــ ڕۆژئاوای کوردستان (سوریا)، کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (ئێران)و کوردی باشووری کوردستان (عێراق) لە ئارادا نەماوە. هەرکەسێک، دەتوانێت بچێتە نێو شۆڕشەوەو ڕۆڵی هەرە بڵندی خۆی یاری بکات. لەم شۆڕشەدا، یەکێتی گەلی کورد خۆی نیشانی ئادەمیزاد دەدات. چ لایەک دەبێت با ببێت، ئامانج یەکە. ئەویش، سەربەخۆبوونو ئازادی کوردستانە. باوەڕی من هەیە، کە ئەم شۆڕشە، لەژێر سەرکردایەتی بەهێزی خۆیدا، فراوانتر ببێتو سەرکەوتنی مەزن بۆ ئێمە پێک بهێنێت.

بەرخۆدان: هەرکەسێک دەزانێو دەبینێ، کە لە باکووری کوردستان، شەڕی پارتیزانی لە مێژووی ١٥/ی ئابی ١٩٨٤و تا ڕۆژی ئەمڕۆش بەردەوامە، هەرچەندە کە هەموو هێزەکانی دەوڵەت کە کوردستانیان بۆخۆ کردۆتە داگیرگەو هەموو هێزە ئیمپریالیزمییەکانیش بێ سنوور هێرشی ئەم شۆڕشە دەکەن، بەڵام دیسانیش، ئەم بزووتنەوەیەی، کە شۆڕش بەرێوە دەبات ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چاکتر خەبات دەکاتو بەرەنگار دەبێتەوەو هەنگاوی مەزنیش بەرەو پێشەوە دەهاوێت؟ تێڕوانینو ڕای ئێوە چییە؟

وانلی: من دەڵێم، هۆی سەرەکیو یەکەمین ئەوەیە، کە شۆڕش خۆی بە چ هێزێکی دەرەوە گرێنەداوە. گەلی کورد بووە پاڵپشتی ئەم

شۆڕشە... ئەمەیە. هۆی دووەمینیش، دیسپلین، پتەوبوونو ڕێکخراوەی PKK بەخۆیەتی. ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە جیهاندا دێنە ئاراوە، چ جارێک نەیانتوانیوە کارلێکردنی خۆیان لەسەر شۆڕش دابنێن، چونکە شۆڕش خۆی بە چ لایەکەوە گرێنەداوە. تەنیا بە گەلی کوردەوە گرێدراوە. بە تێڕوانینی من هۆی سەرەکی ئەمەیە. لە لایەکی تریشەوە، ئەو جوامێرییەو شەهید بوونەی شۆخ‌و لاوان، ژیان‌و پتەوییەک دەدات بە شۆڕش‌و بەرەو پێشەوەی دەبات. لە شۆڕشانی ڕابردووشدا، گەلێک شەهید بوون... خوێنیش گەلێک ڕژا. بەلام بەداخەوە گشتیان بە فیڕۆ چوون‌و ئەنجامیش بووە بنکەوتن، ئێمە باش دەزانین چ بووەو چ نەبووە. کاتێ پارمەتی‌و هاوکاری لە دەرەوە بڕا، شۆڕشی خاوەن ئامانجی ئۆتۆنۆمیش شکستی هێنا. ئێستاش گەلی ئێمە، لە باشووری کوردستان لەنێو ئەنگوچەلەمەو تەنگاوییەکی قووڵدایە. خۆ لە ڕۆژهەلاتی کوردستانیش گەل هەر نازانێت مافی بڕیاردانی چارەنووس چییە.

بەڕاستی مان‌و نەمانی گەلی کورد بە شۆڕش، کە ئێستا لە باکووری کوردستان بەرەو پێشەوە دەچێت، هاتۆتە گرێدان. هۆی ئەمەش جۆراو جۆرن. یەک، چونکە باکووری کوردستان پارچەی هەرەگەورەی کوردستانە. نیوەی گەلی کورد لەم پارچەیەدا دەژیت. نزیکەی ١٥ ملیۆن کورد لە باکووری کوردستان‌و تورکیادا هەنە. دوو، چونکە رزگارکردنی باکووری کوردستان هەنگاوی پێشەمینە بۆ رزگارکردنی تەواوی کوردستان. لەبەر ئەم هۆیەش پێویستە هەر بزووتنەوەیەک‌و هێزێکی کوردی، هەرکەسێک کە خۆی بە کورد دادەنێت، هەرکەسێ کە باوەڕی بە هەبوونی گەلی کورد هەیە... نە تەنیا ئەندامانی PKK، هەروەها ئەندامانی ڕێکخراوەکانی‌تریش، جا چ سەربەخۆبن یاخود پارتی جودا بن، هەموو ڕێکخراوەکان کە خۆیان بە

کورد دادەنێن، پێویستە هەموو تواناو ووزەیان بخەنە گەڕ بە مەبەستی هاوکاری کردنی شۆڕش، کە لە باکووری کوردستان بەرپا بووە. ئەم کارەش بۆ ئازادی گەلی کوردو سەربەخۆبوونی کوردستانە.

بەرخۆدان: لەم دواییەدا سەرهەڵدانێکی میللی لە گەلێک باژێڕو گوندی باکووری کوردستان پێکهاتبوو. هۆی ئەم سەرهەڵدانەش، شەهید کردنی ١٣ جەنگاوەری ئارتێشا رزگاریا گەلێ کوردستان ARGK بوو. لەو شوێنانەی، کە راپەڕینیان بەخۆوە دی، گەل خۆی کردە خاوەن شەهیدان. گەلەکەمان ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئەمە سەرەتای قۆناغێکی نوێیە لە مێژووی گەلی کوردستان‌و ووڵاتماندا. ئێوە ئەم پێشکەوتنە هەنگاوانە مێژووییە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟

وانلی: بەڕاستی ئەم سەرهەڵدانە هەنگاوێکی هەرە بڵندو پێویستە لە دیرۆکی تێکۆشەری کوردی هاوچەرخدا. من بیری ئەوەم دەکرد، کە تێکچوونی بزووتنەوەی کوردی لە پارچەکانی‌تر، سیاسەتی بە تورک کردن‌و تواندنەوەی گەلی کورد بە زەبری کوتەک‌و زۆرلێکردن‌و لێدان، ووڕەو بەهێزی گەلی کورد بشکێنێت، بیری ئەوەشم دەکردەوە، کە دوژمن لەوانەیە بە ئاسانی بتوانێ بە تەواوی مرۆڤی کورد کۆچ پێ بکات بۆ تورکیا. بەداخەوە دیسانیش نزیکەی ٥ ملیۆن کورد چوونەتە تورکیاو لەوێ دەمێننەوە. بەڕاستی ئەمە زیان‌و مەترسییەکی گەلێ گەورەیە. بەڵام هەر دوای پێشکەوتنەکەی ١٥/ی ئابی ١٩٨٤، لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕی چەکدارییەوە تا ئێستا، لەسەر بنکەی قارەمانێتی، شەڕی پارتیزانی لەسەر چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەرزبۆوەو گەلی کوردیش بۆوە خودان دلێرییەکی مەزن. بەڕاستی، شەڕکەرانی ARGK بە پاڵەوانێتی خۆیان کە توانیان بوونە نموونەی بێ هاوتا. پارتیزانانی شۆڕشگێڕ شەرەفی گەلی کوردستانیان گەڕاندەوە. بوێری‌و نەترسییان لە دڵی کورداندا بەهێزتر کرد.

له سالی ۱۹۸٤و به دواوه، گیانی شۆڕشگێڕیو ڕاپەڕین لای گەلی کورد گەلێ بەرزبۆتەوە. ئیتر ترسی مردن له دڵاندا نەماوە. ئەم گۆڕانکارییە له باری ئێمەدا، ئەوە دەخاتە پێش چاوانو نیشانمان ئەدا، کە شۆڕشی کوردستان تازە تێک ناچێت. ئاگری شۆڕش چ جارێک دانامرکێتەوە. گەلی کورد بە زارۆک، پیر، جۆتیارو ڕۆشنبیرییەوە بۆ پاراستنی شەرەفو شارستانیەتی خۆی، بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی ڕاپەڕیوەو ئیتر ئەم گەلە هێزێک نییە کە بتوانێت بیتوێنێتەوە. بەهەر حاڵ، شۆڕش بەپەلە بەرێوە دەچێت... چ هێزێک ناتوانێت بیوەستێنێت.

بەرخۆدان: ژمارەیەکی نە گەلێ کەم لە مرۆڤی کورد لە دەرەوەی وڵاتنو بە تایبەتیش لە ئەوروپا، ڕۆڵی ئەو کەسانە لە شۆڕشدا، دەتوانێ چ بێت؟

وانلی: لەبەر سیاسەتی کۆچ پێکردنو چەوساندنەوەی ئابووریو باری نالەبار، لەسەرەتای سالی ١٩٦٠و بەدواوە، کۆچ کردنێک لە گوندان بەرەو شارەکان ڕوویدا، لە بازێڕەکانی کوردستانیش، کۆچکردن بەرەو ڕووی شارەکانی تورکیا بۆوەو لەوێشەوە بەرەو ڕووی ئەوروپا. ئێستا تەنیا لە ئەڵمانیا، نزیکەی سێ سەد ـ چوارسەد هەزار کوردێک هەیە، زۆربەی زۆریان بە خێزانەوە هاتوونەتە ئەوروپا، لە سەدا ٩٠ کوردی باکووری کوردستانن. بەڕاستی ئەو کوردانەی کە لە ئەوروپا دەژین زۆربەیان کرێکاران دەگرێتەوەو بە ئیشی جۆربەجۆرەوە خەریکن، بەهۆی ئیشوکاری خۆیانەوە یارمەتیەکی چاکی ئابووری ئەوروپایان داوە. بێجگە لەکرێکارانیش، گەلێک خوێنکارو ڕۆشنبیرو بەرزکی گەلێ لە پارتە کوردییەکان لە ئەوروپا دێنە بەرچاو. لەم پارتیانەی کە لە دوای هاتنی ڕژێمی ١٢/ی ئەیلولی ١٩٨٠ وڵاتیان بەجێهێشتووەو هاتوونەتە ئەوروپا. ئەمانەش بە تایبەتی لە ستۆکهۆڵم

جێی خۆیان کردۆتەوەو لەوێ نیشتەجێ بوونە، سەرۆکی زۆربەی پارتییەکان لە سوێد دەمێننەوە.

مرۆڤ زۆر رق ئەستوور دەبێت، کاتێ، کە تەماشا دەکات گەلەکەی پارچە پارچە بووەو لەهەر چوار لای جیهانا پەرتو بلاوبوونەتەوە. بەلام ئەم کەسانە دەتوانن رۆڵی خۆیان بگێڕنو بەلای کەمەوە دەتوانن یارمەتی شۆڕشی نەتەوەیی خۆیان بکەن. کار تەنیا ئەوە نییە کە خۆپیشانداندو پرۆتێست ئەنجام بدەنو خۆیان بە زۆرلێکراوو بندەست بژمێرنو لەبەر دەرگای بیانیان بگەڕێن. چ جارێک نابێ ئێمە بڵێین: (ئێمە گەلێکی مەزلومین، لە سایەی کەرامەتتەوە یاریدەمان بکە.) بەڕاستی، گەر ئێمە بەم چاوە لەخۆ بنۆڕین، لەوانەیە کەسانێکی بیانی بۆماوەیەکی کورت یارمەتیمان بدەن، لەوانەیە هەندێک لە کۆڕو کۆبوونەوەدا باسمان بکەن، لەوانەیە رۆژێک رۆژنامەنووسێک ووتارێک لەسەر ئێمە بنووسێتو لەوانەشە لە کۆبوونەوەکانی دەربارەی مافی مرۆڤا باسمان بکەن. بەلام ئایا ئەمانە بەسن؟! ئەمانە نابنە چارەیەک بۆ دۆزی ئێمە، بێگانان ناتوانن دەرمانێک بۆ دەردی ئێمە بدۆزنەوە. هیممەتی مەزن دەکەوێتە سەرشانی رێکخراوە کوردییەکان. ئەوان پێویستە بێ هیچ مەرجێک پشتگیری شۆڕش بکەن. پێویستە دەرەوەی وولاتیش (هێزە کوردییەکانی دەرەوەی وولات) هاریکاری ناوخۆی وولات بکاتو ناوخۆی وولاتیش پێویستە شەڕی خۆی لە پێناوی سەربەخۆبوونو ئازادی پەرە پێبدات. بەم شێوەیە شۆڕشی ئێمە خۆی دەگەیەنێتە رادەو پێوانەی جیهانی. لەبەر ئەم هۆیەشە، چەند مانگە بیر لەوە دەکەمەوە، کە رێکخراوێکی نێونەتەوەیی بۆ مافی کوردان دابمەزرێنم لەسەر بناغەی مافی بڕیاردانی چارەنووس. پێویستە دۆستانمان لە دەرەوە ئەمە قبووڵ بکەن. پێویستە باش بزانن، کە ئێمە نە تەنیا بێ خاوەنینو زوڵم لێکراوین، نەء! پێویستە بزانن کە ئێمەی

کورد مرۆڤی شۆڕشگێڕین، خاوەنی شۆڕشێکی میللینەو داوای مافی خۆمان دەکەین. بەڵێ، پێویستە گشت بێگانەیەک بەم جۆرە لە ئێمە بڕوانێت. چ جارێک نابێت کە پێمان بڵێن: (ئێوە توندوتیژی بەکاردێنن.) نەء نابێ! با بزانن نە مافی ئەوانە کە ووتەی ئاوەها بڵێن. ئێستا لەسەر خاکی کوردستان هەر جۆرە زوڵمو زۆرییەک لە گەلی کورد دەکرێت. تەنیا ئەوە ماوە، کە بەیەکجاری قڕمان بکەن! لەبەر ئەم هۆیەش، پێویستە لەسەر خاکی ووڵاتی ئێمەدا کوتەکو زەبری شۆڕشگێڕی بە تەواوی پێک بهێنرێت، چونکە زۆرداریو دڕندەیی دوژمنی داگیرکەر لەسەر سەری مرۆڤی مە هەر بڵندە. مافی گەلی کوردە، کە زۆرداری دوژمنان بە کوتەکی دەستی خۆی بکوژێت!

بەرخۆدان: ئێمە داوا دەکەین کە ئێوە باسی ڕۆڵی ڕۆشنبیری کورد لە ئەورووپا بکەن. ڕۆڵی لە شۆڕشی کوردستاندا دەبێ چ بێت؟ ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەورووپا، دەتوانن بۆ شۆڕش چ بکەن؟

وانلی: ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەورووپا هەن. گەلێک لە ڕوناکبیرانی کورد لە ووڵاتانی ئەورووپا دەژین. زۆربەیان بە ئێشو ناڵێنی میللەتەوە بەستراونەتەوە. بەلاّم بەداخەوە، هەندێکیش کەوتوونەتە نێو چوارچێوەی بێ باوەڕیو بێ هیوایی. بێ کارو خەباتی نیشتمانی ماون. تاقمێک لەو ڕۆشنبیرانەش لە دژی شۆڕش، کەلە باکووری کوردستان بەرپا بووە، دەوەستن. ئەمەش تەنیا لەبەر هۆی حیزبایەتی خۆیان. گەلێک پارتی کوردان لە ئەورووپا هەنە، کە دژایەتی PKK دەکەنو لە بەرامبەر شۆڕشیش دەوەستن. مخابن ئەم دووبەندیو دژایەتییەی وان تا ئێستاش بەردەوامە. بەلاّم لەلایەکی ترەوە، پێویستییەتی شۆڕشی ژێر سەرکردایەتی PKK، ئەو شۆڕشەی کە چارەنووسی کوردی پێ بەستراوەتەوە، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو پێش دەچێت. پێویستە تواناو هێزی گەلان لە دەرەوەی ووڵاتیش بێ بەردەو بینە

پاڵپشتی ئەم شۆڕشە بکات! هەر کەسێک بەپێی تواناو لێهاتوویی خۆی، هۆنەر بە هۆنراوەی خۆی، وێنەکێش بە وێنەی خۆی، هونەرمەند بە هونەری خۆی، کرێکار بە کاری خۆی، هەرکەسێکیش کە دەخوازێت شەڕبکات با بگەڕێتەوە وولاتو بە شۆڕشگێڕیەتی خۆی... پێویستە خۆی بخاتە نێو ریزی شۆڕشەوە! پێویستە هەرکەسێک لە ئێمە، هەر پارتیو ڕێکخراوەیەکی ئێمە، بەهەموو تواناو هەبوونی خۆی هاریکاری ئەم شۆڕشە بکات! چونکە، مانو نەمانی گەلی کورد، بەم شۆڕشەوە گرێدراوە...

بەرخۆدان: کوردستان لەنێوان چوار دەوڵەتدا پارچە پارچە کراوە. داخوا دۆزی خودموختاری (ئۆتۆنۆمی)دەتوانێت ببێتە چارەیەکی مەسەلەی کوردستان؟ ئێمە دەمانەوێ هەندێکیش باسی ووتەی ئۆتۆنۆمیو ئۆتۆنۆمیخوازان بکەن.

وانلی: ڕاستە کوردستان پارچە پارچە بووە. ئەمش تەنیا بە ڤیانو ویستی داگیرکەرانو ئیمپریالیزم بووە... تەنیا بە داوای وان بووە. ئەمە هەر بەیەکجار، داخوازی گەلی کورد نەبووە، پێش شەڕی جیهانی یەکەم، کوردستان لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی (ئێران)دا دابەشکرا بوو. بەلاّم هەر دوای شەڕی جیهانی یەکەم بوو بە چوار پارچە. لەسەرەتاوە بەریتانیاو فەرەنسا دەستپێشکەری ئەم کارەیان کرد. ئەو شتەی کە قەوما بە ئارەزووی گەلی کورد نەبوو. ئاماجی شێخ مەحمودی بەرزنجیو شێخ سەعیدی پیران ئاوەدان کردنەوەو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بوو. دوژمنان هەرچەندە بە گەلی کورد یاریان کردبێ، بەلاّم دیسانیش کوردستان یەکەو ناتوانرێ گەلی کورد لەیەکتر جودا بکرێتەوە، ئەمە نابێت! بەلاّم کاتێ ئێمە ئۆتۆنۆمی لە داگیرکەر بخوازین، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە پارچە پارچە کردنی کوردستان بەدەستی داگیرکەران،

ڕاست‌و ڕاست دەسەلمێنن. ئەمەش چ چارێک خواست‌و ئامانج‌و هیوای گەلی کورد نییە! گەلەکەمان سەربەخۆبوون‌و ئازادی دەخوازێت. بەرەو پێشەوە بردنی شارستانیەتی خۆی‌و بەکارهێنانی فەرهەنگی خۆی دەخوازێت. هەرچۆنێک بێ ئۆتۆنۆمی چارەی مەسەلەی کورد نییە، تەنیا دڕکێکە کە دەچەقێتە مێشک‌و دڵانەوە.

لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە سەرەوە لێیان دوام، ئۆتۆنۆمی بۆ ئێمە نابێتە چارەسەر. ئێمە نزیکەی ٣٠ ملیۆن کەسین. مافی ئێمەیە کە بە دەستی خۆمان چارەنووسی خۆمان بەدەست بێنین. مافی ئێمەیە کە کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ دابمەزرێنین‌و ئەو سنوورە دەستکردانەی کە داگیرکەران دروستیان کردووە لەبنەوە هەڵتەکێنین‌و نەهێڵین. لەلایەکی تریشەوە، ئێمە گەلێ جار بۆ ئۆتۆنۆمی ڕابووینە سەرپێ... هەر لەسەردەمی کۆماری مەهابادەوە بگرە تا شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ (مەبەست لە شۆڕشی ئەیلولە) لە باشووری کوردستان. لە باشوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە هەزاران مرۆڤی ئێمە لەپێناوی ئامانجی بێ مانا سەریان نایەوە. هەتا ئێستاش سەرەڕای ڕژانی خوێن، نەمان توانیوە شتێک بەدەس بێنین‌و یا بەدەستمان هێنابێ. بەڕاستی ئەم خوێن ڕژاندنە ئەگەر بۆ سەربەخۆیی نەتەوەیی بایە ئەوا بێگومان سەرکەوتنیشمان وەدەس هێنا بوو. شتێکی تریش لە گۆڕێدایە، کاتێ کە من لە دەرەوەی وڵات بەرپرسیاری شۆڕشی باشوور بووم‌و وتەبێژی بارزانی بووم، زۆرکەس‌و دام‌و دەزگای سیاسی ئەوروپی بە منیان دەوت: (تۆ بانگاشەی ئۆتۆنۆمی دەکەی. ئەمەش مانای ئەوەیە کە مەسەلە، مەسەلەیەکی ئێرانی‌و عێراقییە، مەسەلەیەکی نێوخۆیی ئەو وڵاتانەیە. تۆ بەم شێوەیە ناتوانی مەسەلەی گەلی کورد بگەیەنیتە کۆڕو کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان...) بەڵام کاتێ ئێمە مافی چارەنووسی خۆمان بخوازین، ئەوکاتە کۆبوونەوەی مەزن بۆ ئێمە ڕێک دەخەن‌و ئێمەش

دەتوانین مەسەلەی خۆمان بەڕاستی باس بکەین.

وەک لەسەرەوەش ووتم، گەلەکەمان خوێنی زۆری ڕژاندووە بۆ ئۆتۆنۆمی‌و پارتی جۆر بە جۆریش سەرکردایەتی خەباتی کردووە بۆ ئۆتۆنۆمی. هەرچەندە دۆستایەتیەکی بەهێز لە نێوان من‌و مەسعود بارزانی‌و جەلال تالەبانی‌دا هەیە، بەلاّم دیسانیش ناچارم، کە بەوان بڵێم ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد چارەسەر نییە. بەپێی ژمارەی دانیشتوانی گەلەکەمان‌و فراوانی خاکی کوردستان، پێویستە وولاّتێکی سەربەخۆو ئازاد بۆ گەلی کورد دابمەزرێت.

شتێکی‌تریش هەیە، بەبڕوای من ئۆتۆنۆمیش هیچ جارێک پێک نایەت. چونکە، پێکهاتنی ئۆتۆنۆمی بەندە بە دیموکراتیەکی تەواوو ڕاست. هەتا لە ئەوروپاش ئەمە ناتوانرێت پێک بهێنرێت. هەموومان ئەوەمان دیت کە لە عێراق چ قەوما. ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە دەوڵەت دابووی بە کوردەکان، تەنیا نووسینی سەر پەڕەکاغەز بوو. ئەگەر بڵێین جارێکی‌تر دەوڵەتێکی‌تر ئۆتۆنۆمی بە جۆرێکی‌تر بداتە کوردان، منیش دەڵێم بەڵێ دەبێ، بەلاّم ئەوکاتە بەدەستێک دەبات‌و بە دەستێکیش دەدات! لەبارێکی ئاوەهادا گەلی کورد ناتوانێت ژیان‌و ڕێکخستنی ... ی بەسەربەستی بەردەوام بکات. ئایا چ کاتێک عێراق ئەوە قەبوڵ دەکات کە نەوتی کەرکوکمان بداتێ؟ من باوەڕناکەم بمانداتێ. ئەمەش، تەنیا بەسەربەخۆ بوون دەستەبەر دەبێت نەک بە ئۆتۆنۆمی!

بەرخۆدان: ئەنیا رزگاریا نەتەوا کوردستان ـ ERNK، لە هەموو لایەک‌و بەگشت شێوەیەکیش کەوتۆتە نێو خەباتەوە. بۆسەربەخۆبوونیش، شەڕی چەکداری وەک خەباتی بنچینەیی پەسند کردووە. لە تێڕوانینی ئێوەدا شەڕی چەکداری چ ڕۆڵێک دەبینێ لە رزگارکردنی وولاّت‌و پێویستی بە چ هەیە؟

وانلی: بەڕاستی پێویستی‌و گرنگی شەڕی چەکداری گەلێ بەرزە.

بۆ ئەوەی میللەتێک، بتوانێت هێزی داگیرکەران لەسەرخاکی خۆی قاو بدات‌و وولاتیش رزگار بکات، پێویستە شەڕی چەکداری بکاتە دژی خۆی. پەیماننامەی نووسراوی سەرکاغەز بەتەنێ، وولاتان رزگار ناکات. گەلی کورد ناتوانێت بێ شەڕی چەکداری، مافی خۆی بەدەست خۆی بهێنێت. بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە گەلێکن. لەودەمەی کە شەڕی چەکداری لە باکوری کوردستان هەڵگیرساوە تا ئێستا، زۆر ئەنجامی باش دەرکەوتنە مەیدانەوە، بۆ نموونە سەرهەڵدانی گەلی کورد، خۆ پیشاندان‌و ڕێ ڕۆیشتنی میللی لە باژێڕو گوندەکانی کوردستان دژی سوپای داگیرکەری تورک. شتێکی‌تریش کەوتە بەرچاوان، گەلێک پێویستە: پێش ئەوەی شەڕی چەکداری لە باکووری کوردستان لە ساڵی ١٩٨٤ دەست پێ بکات، هەتا ووشەی (کورد)یش بەجارێ قەدەغە بوو. بەڵام ئێستا وەک دەبینین مەسەلەی کورد دەبێتە ناوونیشانی ووتارەکان لە ڕۆژنامەو گۆڤارە تورکییەکانیش‌دا.

بێجگە لەمانەش، شەڕی چەکداری ئەنجامی هەرە پێویستترینی دەرخستە مەیدانەوە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە، پێویستە شەڕ فراوانتر بێت، واتا نە بە تەنیا شەڕی چەکداری‌و بەس، نا! شەڕکەر بە تفەنگی خۆی، نووسەر بە نووسینی خۆی، دەبێ شەڕ بکەن. نووسینیش لە جێگای خۆی‌دا تفەنگە. پێویستە ڕامیاری ئێمە ستراتیژی‌و هێرش‌بەر بێت. بە ڕاستیش ERNK بەم کارە ڕابووەو ڕادەبێش.

بەرخۆدان: بەبیروڕای ئێوە، پێویستە پەیوەندی‌و هاوکاری پارتە کوردییەکان لەگەڵ یەکتردا لەسەر چ بناغەیەک بێت؟

وانلی: بەڵێ، ئەمە مەسەلەیەکی گەلێ گرنگە. وەک من پێشتریش ووتبووم، گەلی کورد یەکە، کوردستان یەکەو ناتوانرێ پارچە پارچە بکرێن‌و پارچە پارچەش ناکرێن. من بە کورتی دەبێژم: پێویستە مەرجی بنچینەیی داخوازی پێکهێنانی مافی بڕیاردانی چارەنووس بێت نەک

ئۆتۆنۆمی. چونکە لە ئۆتۆنۆمی‌دا بندەستی‌و کۆیلەتی هەیە، ئامانجی یەکەمین پێویستە سەربەخۆ بوون‌و ئازادی کوردستان بێت.

بەرخۆدان: چونکە ئێوە پسپۆڕی (یاسا)ن ، ئێمە دەمانەوێ، باسی تێڕوانینی یاساو پرەنسیپی نێونەتەوان لەمەڕ مافی چارەنووسی گەلان بکەن‌و ڕوونیشی بکەنەوە.

وانلی: لەگەلێک پەیماننامەی نێونەتەوان لەسەر مافی چارەنووسی گەلان شت نووسراوە. گەلێک بڕیار دەرهەق بە چارەنووسی گەلان دراوە. بەکورتی مافی چارەنووس ئەوەیە، کە هەر میللەتێک، هەر نەتەوەیەک خاوەن دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی بێت. گەلی کوردیش، بەسەربەستی، وەک کە دەیەوێت دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێت‌و بە چ شێوەیەک دەبێت با ببێت. مافی گەلی کورد هەیە کە وڵاتی خۆی ئازاد بکات. بە باوەڕی من، هەتا کۆماری کوردستانی ئازاد دانەمەزرێت، چارەسەریش بۆ دۆزی گەلی کورد پەیدا نابێت. پاش دامەزراندنی دەوڵەت، ئەوکاتە ئێمە دەتوانین پەیوەندی خۆمان بە گەلانی دراوسێ ڕا دروست بکەین. تا ئەوکاتەی، کە گەلەکەمان مافی چارەنووسی خۆی بەدەست نەهێنێت، پێویستە بێش هەر شتێک، شەڕی چەکداری خۆی پەرە پێ بدات.

بەرخۆدان: دەوڵەتی ئەڵمانیا دادگای دژی ئەندامانی پارتیا کارکەرێن کوردستان PKK سازکردووە، ئێوە جارێکیش بەشداری ئەم دادگاکردنە بوون؟ ئێمە دەمانەوێ بزانین، بیروڕای ئێوە لەسەر ئەم دادگایە چییە؟

وانلی: بەڵێ، من پێش ئەم وەختە جارێک بەشداری ئەم دادگاکردنە بووم. بە بیروڕای من، ئامانجی کردنەوەی ئەم داوایە لە دژی ئەندامانی PKK، دامرکاندنەوەی ئاگری شۆڕشە کە لە باکووری کوردستان هەڵگیرساوە... ئەمە لەلایەک. لەلایەکی تریشەوە، ڕاوەستاندنی خەباتی

PKKیـه لـه دەرەوەی وولاتو بـەتـایبـەتـیـش لـه ئـەوروپـا... ئـەمـەش پیلانێکی تەواوی دەولەتی تورکیایە. نزمیو بێ شەرەفی ئەلمانیا ئەو ڕاستییانە دەخەنە پێش چاوان. من لەم دواییە بیستم، کە دەولەتی تورکیا لیستەیەکی ناوانی داوە بە ئەلمانیا. کاتێ کە منالانی کورد لە ئەلمانیا لە دایک دەبنو دایکانو باوکان دەچنە دایەرەکانی دەولەت بۆ ناونووس کردنی منالەکانیان، دەولەت گوێرایەلی ئەوان ناکاتو ناوی بە دلی دایکانو باوکان پەسند ناکات. ناوی منالە کوردەکان بەپێی لیستەکەی تورکیا وەک ئۆزتورکو هتد لە منالان دەنێن، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە دەولەتی ئەلمانیا ئارەزووەکانی تورکیای فاشیستو دڕندەو نەژاد پەرست قەبول دەکات. هەندێک جار منیش دەپرسم: (ئایا هۆی ئـەمـە چییـە، کـە تـا ئـێستـاش نـەژادپەرستی هیـتـلەر لـە دلی ئەلمانەکاندا ماوە!) لەلایەکیترەوە، من باش دەزانم، کە گەلی ئەلمانیا لە دڕندەیی هیتلەر بێ تاوانن، سووچی ئەوان نییە. ئەوان گەلێک بە دیموکراتییەوە گرێدراون. جا پێویستە ڕۆلەکانی گەلی ئێمە لە ئەلمانیا لە دژی نا دیموکراتی ڕابوەستن. من باوەڕ دەکەم، کە دادگای ئەلمانیا، بە خۆی مافی ئەوە بداتە کوردان، چ ناوێک بخوازن، دەتوانن لە منالانیان بنێن.

بەرخۆدان: ئێمە گەلێک باسی باری کوردستانو گەلی کوردمان کرد. جا دەمانەوێت هەندێکیش باسی ڕۆژهەلاتی ئەورووپاو یەکێتی سۆڤیەت بکەین. ئەگەر زەحمەت نەبێ، دەتوانن لەم بارەیەوە چ بلێن؟

• وانلی: لە کۆتایی سالی ١٩٨٩و سەرەتای سالی ١٩٩٠ مێژووی جیهان بەپەلە خۆی گۆڕاند. پێشکەوتنی پێویست لە وولاتانی سۆشیالیستدا ڕوویدا. ئەم گۆڕانە، وای لە حکومەتە سۆشیالیستییەکان کرد، کە بیرۆکراتیزم لە نێوان پارتییەکاندا نەمێنێو هەلوەشێن. ئیتر گەلانی ئەم وولاتانەش هەستان بە داواکردنی مافی

چارەنووسی خۆیان، وەکو ئاشکرایە کە هۆی سەرەکی ئەم گۆڕانانە پێش هەر شتێک بیرۆکراتیزمی پارتیگەری بوو، دیکتاتۆریەتی سەرانی پارتیو دەوڵەت بوو. بەرژەوەندییەکانی ئەندامانی ئەم پارتە کۆمۆنیستییانە، لەسەروەی بەرژەوەندییەکانی گەل دەگیران. پاش ئەوەی کە گۆرباچۆڤ هاتە سەرحوکمو (پەرەسترۆیکاو سەرلەنوێ ئاوەدان کردنەوە)ی پێش خست، ئەو گۆڕانکارییانە لە جیهانو بە تایبەتی رۆژهەڵاتی ئەورووپاو یەکێتی سۆڤییەتدا ڕوویداو هاتنە مەیدانەوە. ئەمەش سوودێکی مەزنی هەبوو بۆ کوردەکانی یەکێتی سۆڤییەت. ئیتر ڕێ بۆ ئەوانیش کرایەوە، کە داوای مافی خۆیان بکەن. چونکە، وەک من دیتوومە، کوردەکانی یەکێتی سۆڤییەت هەتا هەتایێش بە وولاتی خۆیان گرێدراونو ئامانجیان تەنیا کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادە.

بەرخۆدان: جەنگاوەرانو پارتیزانانی ئارتێشا رزگاریا گەلێ کوردستان ـ ARGK تا ڕۆژی ئەمڕۆش، لەچیا بەرزەکانی کوردستان سنگی خۆیان داوەتە بەر سنگی سوپای داگیرکەرو دڕندەی تورک. بە قارەمانی بۆ سەربەخۆ بوونو ئازادی کوردستان خەبات دەکەن. ترس مردن، لەدڵی داگیرکەران دەچێنن. دەتوانن چ برووسکە نامەیەک یا پەیامێک، بەپێی داخوازی خۆتان بۆ وان بنێرن؟

وانلی: بەرێزو هەستی شۆڕشگێڕی، لە قووڵایی دڵەوە، سلاوی خۆم بۆ گەریلا (پارتیزانان)ی قارەمانو پاڵەوان کە مردن دەترسێنن، دەنێرم! هەروەها سلاوی شۆڕشگێڕانەش بۆ شەهیدان، کە ژیانی خۆیان کردە دیاری ئازادی کوردستان، دەنێرم! دیسانیش گەلێک سوپاسی ئەندامو خەباتگێڕانی پارتیا کارکەرێن کوردستان ـ PKK دەکەم، چونکە ڕێکخستنی وان گەلێک ڕێکوپێکو دیسپلینیو بەهێزە. بەڕاستی، بەرێزەوە باسی سەرهەڵدانی گەل دەکەم، کە لە ئەنجامی تێکۆشانی

ئەواندا هاتۆتە کایەوە. ئەم شۆڕشە، بوێری، دلێری‌و جەسارەتی داوەتە گەلەکەمان. گەلیش لە کۆلانانی بازێڕەکانی کوردستان، هەر لەسەر هەمان بنکە، هێزی دوژمنی ژمارە زۆری شکاندووە. من هاوڕێتی خۆم پێشکەش بە شۆڕشگێڕانی ARGK دەکەم‌و دەبێژم: (بەدل، بە مێشک، بەهەموو توانای خۆم، من لەگەل ئێوەمە...) من باوەڕ دەکەم کە ئەم تێکۆشینە ڕاستە زولم‌و زۆر لەسەر کوردستان‌و بەلکو لەسەر گەلی تورکیش ناهێلێت... هیواکانی گەل پێکدێنێت. ئێمە پێکەوەینە... دەست لەناو دەست، شان بە شان، بۆ کوردستانێکی سەربەخۆو ئازاد!

بێگومان سلاوی منی پێشەمین لە هەڤالو سەرۆک عەبدوللا ئۆجالان بێت... لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی‌و نووسینگەی سیاسی PKKو سەر لەشکرانی ARGK بێت.

بەرخۆدان: دەتانەوێ دوا ووتەی دوایی خۆتان پێشکەشی خوێنەرانی ڕۆژنامەی بەرخۆدان بکەن؟

وانلی: من ووشەی هەڤال بەندی لە خەباتدا پێشکەشی وان دەکەم‌و دەلێم، ئێمە گشتمان بۆ سەربەخۆ بوون پێکەوەین، پێکەوە، لەسەر ئەم ڕێگایەین! دیسانیش سلاو لە سکرتێری گشتی PKK عەبدوللا ئۆجالان، لە خەباتی بەرزو پیرۆزی ئەو ئەکەم.

بەرخۆدان: لەکۆتاییدا بەناوی ڕۆژنامەکەمانەوە، دیسان سوپاستان دەکەین بۆ ئەو هەلەی کە بۆ ئێمەتان ڕەخساند، تاکو بتوانین ئەم گفتوگۆیە ئەنجام بدەین.

وانلی: منیش سوپاسی ئێوە دەکەم، کە ئەم کاتەتان‌دا بەمن... زۆر سوپاس بۆ ئێوە.

# دکتۆر
# ئیسماعیل بێشکچی

هەڵبەتە ناوی کۆمەڵناس‌و زانای بەناوبانگی تورکی دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی لای ڕۆشنبیرانی کورد شارراوە نییەو لە مێژەوە ناسراوە. د. بێشکچی هەر لە ساڵی ١٩٦٧ەوە خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستی‌و کتێب دانان بووە دەربارەی مەسەلە هەمە چەشنەکانی کۆمەڵگای کوردەواری‌و کوردستان. بێگومان هەر لە بەر هەمان هۆ ناوبراو تووشی چەندەها تەنگوچەڵمەی هەمەجۆر بووە بەتایبەتیش گرتن‌و زیندان لەلایەن ڕژێمی فاشیستی تورکیاوە. تەنیا تا ساڵی ١٩٨٧ دە ساڵ‌و دە مانگ لە گرتووخانەدا ژیانی بردبووە سەر. ئیسماعیل بێشکچی هەر لەوکاتەی لە کوردستان بۆتە کارمەند واتا ساڵی ١٩٦٠و بەدواوە هەمیشە بەکاری زانستییانەی خۆی خەریک بووەو تا ئێستا چەندەها بەرهەمی نایاب‌و بە نرخی بڵاوکردۆتەوە کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن (بە زمانی تورکی) :

١) شیکردنەوەی نومایش‌و دیاردەکانی ڕۆژهەلات، ئەرزەڕۆم ١٩٦٧.

٢) گۆڕانی کۆمەلایەتی لای هۆزە کۆچەرە کوردەکانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات، ئەرزەڕۆم ١٩٦٨.

٣) ڕۆژهەلات‌و شێوەی پێکهاتنی هۆزی کۆچەری (عەلیکان) ئەنقەرە ١٩٦٩.

٤) باری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ ـ کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و ڕەگەز،

ئەستەمبوڵ ١٩٦٩.
٥) شێوازی زانستی، ئەستەمبوڵ ١٩٧٦.
٦) شێوازی زانستیو کارگوزاری لە تورکیا، بەشی یەکەم: نیشتەجێ‌کردنی ناچاریی کوردان، ئەستەمبوڵ ١٩٧٧.
٧) شێوازی زانستیو کارگوزاری لە تورکیا، بەشی دووەم: مێژووی نوێی تورکیاو تیۆری زمانو کێشەی کوردی، ئەستەمبوڵ ١٩٧٨.
٨) شێوازی زانستیو کارگوزاری لە تورکیا، بەشی سێیەم: دەستووری پارتی (جمهوریەت)ی ساڵی ١٩٢٧و مەسەلەی کوردان، ئەستەمبوڵ ١٩٧٨.
٩) سێ کتێبی‌تر کە لەم دواییەدا بڵاوبوونەتەوە:
- کوردستان کۆلۆنی نێو دەوڵەتانە.
- زانستو ئایدیۆلۆژی ڕەسمی، دەوڵەتی دیموکراتیو مەسەلەی کوردان.
- ڕۆشنبیرێک، ڕێکخراوێکو پرسی کوردان.

ئەوەی ڕاستی بێ نووسین لەسەر مرۆڤێکی وەک ئیسماعیل بێشکچی بە لاپەڕەیەکو دووان تەواو نابێت، چونکە کەسانێکی وەک ئەو بەدەگمەن هەڵدەکەونو هەڵکەوتوونە لەناو گەلە سەردەستەکانی ناوچەکەو ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کە کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە.

پێش ئەوەی بچینە نێو ناوەڕۆکی ئەم چاوپێکەوتنەی خوارەوە دەمەوێ سەرنجی خوێنەرانی بەرێز بۆ خاڵێک ڕابکێشم: شتێکی بێ پێچو پەنایە کە ئەم چاوپێکەوتنە لە لایەن ڕۆژنامەی سەرخۆبوون SERXWEBUN ئەنجام دراوەو ئەم ڕۆژنامەیەش ئۆرگانی ناوەندی پارتی کرێکارانی کوردستان PKKیە. زۆربەی زۆری باسەکانیش بە شێوەیەکی تایبەتی کوردستانی باکوور دەگرنەوە. گەرچی ئەم

چاوپێکەوتنە ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕیوە (٢٩/١١/١٩٩٠)، بەڵام دڵنیام لەوەی کە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە بابەتانە بە شێوە زاراوەی کرمانجی خواروو لە سوودو قازانجی ئێمەدا دەبێت نەک زەرەرو زیان.

ئەم چاوپێکەوتنە بۆجاری یەکەم لە ڕۆژنامەی سەرخۆبوون بە زمانی تورکی بڵاوکراوەتەوەو لە لایەن (یەکێتیا ڕوشەنبیرێن وەلاتپارێزێن کوردستان YRWK کراوەتە عەرەبی‌و ئێمەش بۆ دەسکاری کردن کردوومانە بە کوردی. هەروەها ماوەیەکە ئەم بابەتەم ناردووە بۆ گۆڤاری یەکگرتن لە دانیمارک، هەرچەندە پەیمانی بڵاوکردنەوەشیان پێداوم، بەڵام تاکو ئێستا بڵاونەبۆتەوە. ئاواتەخوازم خوێنەرانی ئازیز سوودێک لەم چاوپێکەوتنە وەربگرن.

مەهاباد کوردی

سوێد: ١٩٩٢

* * *

# پارتی کرێکارانی کوردستان PKK نەتەنیا لە کوردستانی باکور بەڵکو لە سەرانسەری کوردستاندا یەکێ لە هێزە بنچینەییەکانی باوەڕپێکراوە

سەرخۆبوون: ئێمڕۆ گەلی کوردستان لە دەوری پارتی خۆی PKKو بەرەی خۆی ERNKو لەشکری خۆی ARGKدا کۆبۆتەوە لە پێناوی سەربەخۆیی‌و رزگاربوون لە کۆیلەتی، وە گرتنی جێگای ڕاستی خۆی لە نێو مرۆڤایەتی هاوچەرخدا. ئایا دەتوانن ڕای خۆتان

لەم بارەیەوە دەربڕن‌و پەیامی ئێوە چییە بۆ گەلی کوردستان؟

بێشکچی: بیروباوەڕی PKKو چالاکی ئایدیۆلۆژیو ڕامیاری ئەو وەرچەرخانێکی گرنگی نە تەنیا لە مێژووی کوردستانی باکوور، بەڵکو لە مێژووی سەرانسەری کوردستاندا بەرپا کرد. PKK ژیانو گیانی گەڕاندەوە بۆ مرۆڤی کورد کە هەموو مافێکی دیموکراتیو نەتەوەیی پێشێل کرا بوو، مرۆڤی کورد کە ناسنامەی کەسێتیو کوردێتی خۆی لێ یاساخ کرا بوو. ئەو میللەتە کۆیلەیەی کە بە شێوەیەکی گشتی وەکو تەنێکی بێ کەسێتی لێ هاتبوو، ژیانو گیانی وەبەرهێنراوە لە لایەن PKK. گەلێک کە لە سایەی پیلانەکانی ئیمپریالیزم خۆی وەندا کردبوو، دووبارە کەوتەوە بیرکردنەوە، ئەوەش لە ڕێگای پارتی کرێکارانی کوردستان بوو. هەڵبەتە PKK لەسەر زەوییەکی بیابانو چۆڵ لەدایک نەبوو. گەلی کورد لە سەراپای کوردستانو لە کاتە جیا جیاکاندا سەرهەڵدانو ڕاپەڕینی بەرپاکردووە. گەلێک جووڵانەوە ڕووی داوە لە باکورو باشورو ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا. خەبات لە کوردستان (باشور) لەبن سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانو سەرۆکەکەی مەلا مستەفای بارزانی بەردەوامی کرد تا ساڵی ۱۹۷۰. کۆماری مەهاباد لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دامەزرا. هەر لە پێش شەستەکانەوەو دوای شەستەکانیش گەلێ ڕووداو لە کوردستانی باکوور قەوماوە کە کاریگەرییەکی گەورەیان هەبووە لە بواری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا. بۆ نموونە مەسەلەی بەندکردنەکەی (٤٩ کەس)و مەسەلەی بەندکردنەکەی (۲۳ کەس)و دامەزراندنی پارتی کرێکارانی تورکیو دروست بوونی لقی پارتی دیموکراتی کوردستان لە (خۆرهەڵات)و شانە ڕۆشنبیرییەکانی خۆرهەڵات. هەڵبەتە خۆپیشاندانەکان لە ڕۆژهەڵاتو دادگا کردنەکان لە ڕۆژهەڵات لە ساڵی ۱۹۷۱و ئەوانیتر هەموویان ڕووداوی بنچینەیی گرنگ بوون. ڕزگاری کۆمەڵ، ڕێگای ڕزگاری، کاوا، شۆڕشگێڕە دیموکراتیە ڕەزەکانو بڵاوکراوەکانو ڕێکخراوەکان

کاریگەری خۆیان هەبووە لە پرۆسێسی پێشکەوتنی ئێستادا. ئەوانە گشتیان رۆڵی خۆیان هەبووە. بەلاّم رۆڵی ڕاستەقینە دەگەڕێتەوە بۆ PKK. پارتی کرێکارانی کوردستان نە تەنیا لە کوردستانی باکور بەڵکو لە سەرانسەری کوردستاندا یەکێ لە هێزە بنچینەییەکانی باوەڕپێکراوە. PKK بنیاتی چینایەتی سەرکردایەتی شۆڕش‌و بزووتنەوەی دیموکراتی‌و نەتەوایەتی کوردی گۆڕاند. PKK وەک بزووتنەوەیەکی رۆشنبیران‌و خوێنکارانی کورد هاتە نێو کۆڕی خەبات. پاش سەرهەڵدانی PKK سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد جارێکی‌تر نەکەوتە دەستی شێخ‌و بەگ‌و سەرۆک هۆزەکان‌و موڵکدارانی زەوی. بێگومان ئەوانە توانای ئەوەیان هەیە جێگای خۆیان بکەنەوە لە نێو بزووتنەوەی کورد داو بە پێی نیشتمانپەروەریتییان. ئەوەش بە گۆڕانێکی مەزن‌و بناغەیی دائەنرێت. چەند شتێک هەن کە لای کوردان ناسراون بەلاّم دووبارەکردنەوەیان کارێکی چاکە. بە کورتی:

أ- گاندی سەرۆکی بزووتنەوەی ئازادی هیندستان وتوویەتی: «باج نەدەنە ئینگلیزەکان. خزمەتی سەربازی نەکەن لەنێو سوپای ئینگلیزیدا. قوماشی دروستکراوی کارگە ئینگلیزییەکان لەبەرخۆ نەکەن. لە قوتابخانە ئینگلیزییەکان نەخوێنن. بە زمانی ئینگلیزی قسە نەکەن...» ئا بەو جۆرە رێبازی گاندی بەناوبانگ بە رێبازی خۆیێ ناوزەد کراوە. رێبازی خۆیێ کە گاندی رێبەرایەتی کردووە هەمان مانای رێبازە درێژەکەی مارتسی تۆنگی هەیە. گاندی لە باکوورەوە بۆ باشوری هیندستان خەڵکی ئاگادار دەکردەوە کە خۆی‌ئینگلیزەکان بەکار نەهێنن. رێبازەکەی مەلا مستەفای بارزانیش لە مانگەکانی نیسان‌و ئایاری ۱۹٤۷ لە ناوچە سنوورییەکانی نێوان عێراق‌و ئێران‌و تورکیاو لەژێر بۆردومانی فرۆکەی ئینگلیزی‌و هەموو ئەو شەڕانەی کە ئەنجامیدا تا گەیشتە سنوورەکانی یەکێتی شۆرەوی‌و پەنا بردنە ئەوێ. بێگومان

ئەمیش ڕێبازێکی بەماناو ناوەڕۆکە.

من بە شێوەیەکی تایبەتی ڕاکانی گاندی دەربارەی مەسەلەی زمان بە بایەخدار ئەزانم من بایەخ‌نەدانو پشتگوێ خستنێکی مەزنی بزووتنەوەکانو PKK لە کوردستانی باکور دەبینم دەربارەی نەدانی بایەخێکی پێویست بە مەسەلەی زمانی کوردی. ئەدەبیاتی ڕێکخراوەکانو بڵاوکراوەکانو گۆڤارەکان بە زمانی تورکی بڵاودەکرێنەوە. کوردەکان لە نێوان خۆیاندا قسەو دەمەتەقێ بە تورکی دەکەن. لێرەدا وا پێویست دەکا کە ووتەکەی گاندیمان بێتەوەیاد. پێویستە لەسەر کوردەکان کە هەمیشە ناوەڕۆکی ووتەکەی گاندی‌یان بێتەوە یاد. کاتێ کە بایەخی کوردەکان بۆ ئەم کارە دێتە ئاراوەو یاخود تووشی ڕەخنەگرتن ئەبن ئەوا پیاو وەڵامی نامۆی گوێ لێدەبێت وەک خەباتی ئێمە دژی بەرپەوەبەرایەتی ئیمپریالیزمی تورکی‌یە. ئێمە دوژمنی تورکەکانو زمانی تورکی نین. ئەو ووتانە وەکو من مەبەستمە ناتوانرێ بە وەڵام بژمێردرێن.

بۆ نموونە لە زەویەکانی فەلەستینی داگیرکراو لە لایەن ئیسرائیل، فەلەستینییەکان بە شێوەیەکی سروشتی بە زمانی عەرەبی دەدوێن. کاتێکیش بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن داوای لێبووردنو ڕێگەپێدان لە ئیسرائیلییەکان ناکەن. لەوانەیە فەلەستینییەکان هەندێ وەخت بە عیبریش بپەیڤن. ئەمە لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕوو دەدات. بەڵام بێ شک هیچ فەلەستینییەک بەو شێوەیە نابێژێت کە ئێمە شەڕی جوولەکەو دەوڵەتی ئەوان دەکەینو لە هەمان کاتدا دژی زمانی عیبری نین. وادیارە ئەم بابەتە زۆرتر خراپەو خراپەش زۆر قووڵە. لە بواری بەکارهێنانی زمانی کوردی دەتوانین ڕۆشنبیرە کوردەکان دابەشی چوار بەش بکەین. بەشی یەکەم زمانی کوردی‌یان بەتەواوی لەبیرچۆتەوەو ناتوانن بە کوردی بدوێن. هەڵبەتە ناشتوانن بە کوردی بنووسن یا

بخوێننەوە. دەوڵەت وا دەزانێت کە سەرکەوتوو بووە لە (تواندنەوە)ی ئەوانە... وا بڕوا دەکەم دەوڵەت لەم بارەیەوە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ. وا گریمان کە کوردێک زمانی خۆی بە تەواوی لەبیرچۆتەوە، بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان هەستی بەوەکرد کە کوردەو دەرکی بەوەکرد کە بۆچی توێنراوەتەوە، دوای ئەمە دەستی کرد بە بەرگری کردن لەو مەسەلانەو بەرگری کردن لە بوونی کۆمەڵگای کوردەواری‌و خەباتیشی لە پێناوی‌دا ئەنجامداو بە خەباتی خۆی ئەوەی سەلماند کە تواندنەوە لە سنووری کاریگەری خۆی دەوەستێت‌و توانای خۆی لەدەس ئەدات. بە بڕوای من لە ساڵەکانی ١٩٦٩-١٩٧١و پەیدابوونی کۆمەڵەکانی ڕۆشنبیری‌و شۆڕشگێری لە ڕۆژهەڵات بووە هۆی وەستاندنی تواندنەوە. لێرەدا تەنیا بۆ دەستنیشانکردن ئەم باسەم هێنا گۆڕێ. بەشی دووەم ئەو کوردانەن کە بە زمانی کوردی گفتوگۆ دەکەن بەڵام ناتوانن بە هەمان زمان بنووسن یا بخوێننەوە. ژمارەی ئەم بەشە گەلێ زۆرن. بەشی سێیەم پێکدێ لەوانەی کە بە کوردی دەدوێن‌و دەتوانن بە کوردیش بخوێننەوە. وا باوەڕدەکەم کە ئەمانە ژمارەیان کەمە. بەشی چوارەم پێکدێ لەوانەی کە بە زمانی کوردی دەپەیڤن‌و دەنووسن‌و دەخوێننەوە. شتێکی ڕوونە کە ژمارەی ئەوان زۆر کەمەو بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن... نووسین‌و خوێندنەوە بە کوردی شتێکی ئاسان نییەو وەدیهێنانی زەحمەتە. ئەمە کارێکە کە داوای پەروەردە کردنێکی باش‌و پشوودرێژ ئەکات. وەک دەردەکەوێ‌و ڕوون دەبێتەوە کە نەبوونی توانای کوردەکان لە دەرکردنی گۆڤارو بڵاوکراوەکان‌و نووسینیان بە زمانی کوردی نە بە هۆی هاوڕێیەتیانە بۆ زمانی تورکی بەڵکو بەهۆی نەزانینی کوردییە... پێویستە بە چاوی کەمی کوردەکان لەم فرمانەوە بڕوانین. بەڵام کوردەکان دان بەم کەمییەدا نانێن‌و ئەم کەمییەش بە ووتەکانی نێونەتەوایەتی‌و شۆڕشگێڕی‌و سۆشیالیستی‌و لەم جۆرانە

دادەپۆشن. پارتی کرێکارانی کوردستانیش خاوەن تێڕوانینی تایبەتی خۆیەتی لەم بارەیەوە. ئەم تێڕوانینە تایبەتیەش لە کاتێکا دەرکەوت کە سەرنووسەری گۆڤاری (بەرەو . . . ٢.) لەگەڵ سکرتێری گشتی حیزب عەبدوڵلا ئۆجالان لە ساڵی ١٩٨٩ چاوپێکەوتنێکی ئەنجام دابوو. بە کورتی لەو چاوپێکەوتنە گوترا بوو: (وادیار دەبێ کە ئێمە زمانی تورکی بۆ ماوەیەکی تریش بەکار دەهێنین. بایەخی پێویست، دوای دامەزرانی دەوڵەتی ئێمە، دەدەینە زمانی کوردی. لەوانەیە پێویستمان بە زمانی تورکی هەبێ هەتا دوای دامەزرانی دەوڵەتیش).

لە شەستەکانو حەفتاکان شۆڕشگێڕە تورکەکان بە کوردەکانیان دەووت: (وەرە با پێکەوە شان بەشان بوەستینو خۆمان لەیەک جیانەکەینەوەو جیاوازی نەکەوێتە نێوانمانەوە. سیاسەتی ـ ناکۆکی دروست بکە سەردەکەوی ـ سیاسەتێکی ئیمپریالیزمەو نابێت ببینە نۆکەری کۆلۆنیالیستان. با پێکەوە سۆشیالیزم پیادە بکەین لە تورکیا. بە بنیاتنانی سۆشیالیزم کوردەکانیش مافەکانی خۆیان دەست دەکەوێ.) ئەم ووتانە ئازادی کوردەکان بۆ ماوەیەکی دوور وەدوا دەخات. هەڵبەتە هیچ پێشنیارێکی تریان نەبوو دەربارەی سەربەخۆیی کوردستان. لەبەر ئەوە دواخستنی بیرۆکەی بایەخدان بە زمانی کوردی تاکو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی وەکو ڕاکانی تورکە سۆسیالیستییەکانی لێدێت. پێویستە بایەخێکی تەواو بە زمانی کوردی بدرێت. پێویستە هەموو کارو کردەوەیەک ئەنجام بدرێت لە پێناوی قسەکردنو نووسینو خوێندنەوە بە زمانی کوردی. ئەو پسپۆرانەی کە شارەزاییان لە زمانی کوردی هەیە دەڵێن کوردی زمانێکی دەوڵەمەندە. بەڵام بەکارنەهێنانو نە نووسینو نەخوێندنەوە بە هەر زمانێک دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوەی ئەو زمانە. زمانی نووسراوەو خوێنراوە پێش دەکەوێو دەوڵەمەند دەبێ. زمانی کوردی یەکێکە لەو

زمانانەی کە زۆرتر دووچاری هێرشی لەناوبردنو ئیمپریالیزم بووە. ئەم زمانە تووشی هێرشەکانی تورکیو عەرەبیو فارسی بووە. کولتوری ئیمپریالیزمی تورکیو عەرەبیو فارسی بەهەموو شێوەیەک هەوڵدەدەن بۆ لەناوبردنی زمانی کوردیو شێواندنیو هەموو هەوڵێک دەقۆزنەوەو زۆر بە چاکی بەکاری دەهێنن بۆ ئەم مەبەستە. رزگارکردنی زمانی کوردی لە کارلێکردنە ئیمپریالیزمیو کۆلۆنیالییەکان بەکارێکی گرنگی بەپەلە ئەژمێردرێت. بچووک کردنەوەی ئەم کارە بە هەڵوێستێکی ڕاست دانانرێتو هەڵوێستی ئاوەهاش خزمەتی کولتوری ئیمپریالیزمی دەکات. هەندێک دەبێژن زمانی کوردی. زمانێکی سەرەتاییەو توانای دەربڕینو بەکارهێنانی نییە لەکاری ئەدەبیداو پێشخستنی زمانێکی سەرەتایی کارێکی دیموکراتیو شۆڕشگێڕی نییە. واتا قسەکردنو نووسینو خوێندن بە زمانی کوردی قەدەغە دەکەنو هەوڵدانەکانی ئێستا سزابار دەکەن. ئەمە لە لایەکو لە لایەکی تریشەوە بانگاشەی ئەوە دەکەن کە :(زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییە. ئایا هەوڵدان بۆ بەرەوپێشەوەبردنی زمانێکی ئاوەها کارێکی کۆنەپەرستانە نییە.) لەبەر ئەوە پێویستە پروپاگەندەکانی ئیمپریالیزم ئاوبدرێنو کارلێکردنیان نەهێڵرێ. پێویستە لەسەر کوردەکان گاندی باش ناس بکەن. (گاندی خەباتگێڕێکی خراپ بووە، چونکە دژی خەباتی چەکداری بووە.) تێڕوانین بەم جۆرە لە گاندیو کەمکردنەوەی دەبێتە هۆی خۆخەپاندن. بێجگە لەمانەی کە ووتران، بەکارهێنانی زمانی کوردیو بنیاتنانو بەرەو پێشەوەبردنی زمانێکی نووسراویو ئەدەبی هاوبەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە خودان ماناو کارێکی ڕامیاریش. ئەو ئەرکو کارە ڕامیارییەش ئەوەیە: وەک ئاشکرایە کوردستان دەوڵەتێکی دابەشکراوو پارچە پارچەکراوەو ئەم کارەش هەڵبەتە نەتەوەی کوردیش دەگرێتەوە... سیاسەتی (ناکۆکی نانەوە)ی ئیمپریالیزم

خاسیەتێکی تایبەتی هەیە کە نابێ لەبیرمان بچێتەوە. ئەم سیاسەتە بۆی هەیە لەهەر کاتێک‌و شوێنێک‌دا زیندوو ببێتەوە. دابەشکردنی کۆمەڵگای کوردەواری زۆر قووڵە. کوردەکان لە تورکیاو ئەورووپا پیتی لاتینی بەکاردەبەن‌و لە عێراق‌و سووریاو ئێران پیتی عەرەبی بەکاردەبەن‌و لە یەکێتی سۆڤیەت‌دا پیتی کریلی. بەکارهێنانی کوردەکان بۆ جۆرەها پیت وایان لێدەکات کەبەتەواوی لەیەکتر تێنەگەن، ۷ هەتا ئەگەر زمانی کوردیش زۆر باش بزانن. ئەمەش لە بناخەوە سیاسەتی جیاوازی خستنە نێو کورد بووەو ئێستاش ئەم سیاسەتە هەربەردەوامە. مادام کار بەم شێوەیەیە، پێویستە بەهەر شێوەیەک کار بکەین لەپێناوی نەهێشتنی کاریگەری ئیمپریالیزم‌و دروست‌کردنی زمانێکی ئەدەبی هاوبەش، ئەوەش پێویستی بە خەباتی دووروودرێژ هەیە. لەبەر ئەوە دواخستنی ئەم کارە تا پەیدابوونی دەوڵەتی سەربەخۆ شتێکی زۆر هەڵەیە. ئەم هەڵوێستەش کارەکە تا ماوەیەکی نادیار وەدوا دەخات. ئەوە هەڵوێستێکە کە بایەخدانی پێویست بۆ زمان‌و رۆشنبیری کەم دەکاتەوەو دروستبوونی دەوڵەتیش فەرامۆش دەکات. ئەو نەتەوەیەی کە زمان‌و کولتوورو مێژووی خۆی بپارێزێت‌و لێکۆڵینەوەی ئەدەبییان لەسەر بکات ئەوا هەستیشی زیاد دەبێت بەرەو ئازادی‌و سەربەخۆیی. بابزانین مستەفا ئەتاتورک چی گوتووە. مستەفا کەمال بۆ ئەندامانی کۆنگرەی ئەکادیمیای مێژووی تورکەکان کە لە ساڵی ۱۹۳۰ بەستراوە وتوویەتی: «ئایا دەزانن بۆچی ـ بولقان ـمان لەدەست چوو؟ بیرکردنەوە لەم کارە شتێکی بەکەڵکە، میللەتانی بولقان ـ بولگاری، سەربی، رۆمانی ـ هەر لەسەرەتاوە پیتی نووسینیان بۆخۆ دروست کرد. لێکۆڵینەوەیان دەربارەی زمان‌و ئەدەبی خۆیان ئەنجام داو بایەخیان پێداو زمان‌و کەلەپورو ئەدەبی خۆیان پێش خست.

ئاخاوتن‌و نووسینیان بە زمانی خۆیان کرد. بایەخیان بە زمانی

تورکی‌و فەرهەنگی عوسمانی نەدا. کاتێ کە بیشیان لەم بوارە پێشکەوتنیان وەدەست هێنا، ئەوا بڕیاریاندا جودا ببنەوە لە عوسمانییەکان‌و دەستیان کرد بە خەبات کردن... پێویستە ووتەکانی ئەتاتورک هەڵسەنگێنین. مرۆڤ دەتوانێت سوود لەم ووتانە وەرگرێ‌و بە دوو شێوە لێکیان بداتەوە. پیاو دەتوانێ یەکەم بەم شێوەیە بیربکاتەوە: نەتەوەیەکی ژێر دەستی سیاسەتی ئیمپریالیزم پێویستە توژینەوە دەربارەی زمان‌و کولتووری خۆی ئەنجام بدات‌و بایەخیش بەم کارە بدات لە پێناوی سەربەخۆیی‌و ئازادی. پێویستە فەرهەنگ‌و فۆلکلۆری خۆی زیندوو بکاتەوە. پێویستە بنەماو نرخی نەتەوایەتی خۆی بپارێزێ. هەتا نەتەوەی سەردەست‌و سەربەخۆش پێویستە بایەخ بە داب‌و نەریتی نەتەوایەتی خۆی بدات تاکو بتوانێت سەربەخۆیی‌و ئازادی خۆی گەشە پێ بدات‌و پتەوتر بکات‌و دام‌و دەزگا تایبەتییەکانی خۆی دابمەزرێنێت. پێویستە چاو لە ئەتاتورک بکەین تا بزانین لەم بارەیەوە چی بۆ نەتەوەی تورک کردووە. دامەزرانی ئەکادیمیای زمان‌و مێژوو و فۆلکلۆری تورکی‌و جێبەجێ کردنی لێکۆڵینەوە دەربارەی فەرهەنگی تورکی‌و پارمەتیدانی ماددی‌و مەعنەوی بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامی بیرۆکەی ئەتاتورک بوو. دەتوانین بە شێوەیەکی‌تریش بیر لە ووتەکانی پێشوو بکەینەوە... لەبەر ئەوەی خەبات کردن بۆ زمان‌و ئەدەب‌و کەلەپور بیری یەکسانی‌و هاوبەشی لای ئادەمیزاد دروست ئەکات، ئەوا دوورخستنەوەو بێ بەشکردنی میللەتێک لەسەربەخۆیی‌و ئازادی لە ئەنجامی لەناوبردنی زمانەکەیەوە ئەنجام ئەدرێت. داخستنی ڕێگەی پێشکەوتنی زمان‌و فەرهەنگ‌و ئەدەب‌و فۆلکلۆر سەرکەوتووترین شێوەی کۆیلەکردنی میللەتێکە. ئا لەم بوارەدا پێویستە سیاسەتی کەمال ئەتاتورک تایبەت بە کوردستان‌و زمان‌و فەرهەنگ‌و مێژووی کوردی تێبگەین. ئەو سیاسەتەی کە لە ئامانجی باڵای‌دا دەستەمۆکردنی

گەلی کوردو داخستنی دەرگای پێشکەوتنی کەسێتییەکەی و ڕووخاندنی بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردی مەبەست بوو. لەپێناو گەیشتن بەم ئامانجە پێویستە کوردەکان بێ زمان و کولتور بمێننەوە.

وابڕوا دەکەم ئەو مەسەلەیەی کە لە ساڵی ١٩٧١ لە ئارادا بوو ئێستاش بەردەوامە. لە ساڵی ١٩٧١ لە زیندان زیندانییە کوردەکان بە تورکی لەگەڵ یەکتر دەدوان. هەڵبەتە زمانی کوردیشیان دەزانی. بەڵام ئەوەیان بەپێویست نەدەزانی کە بە کوردی قسە بکەن. کاتێ کە پرسیاریان لێ بکرایە: بۆچی بە کوردی قسە ناکەن؟ وەڵامیان ئەوە بوو: ئەم کارە بۆ ئێمە بۆتە خوو و نەریت یاخود ناتوانین بە تەواوی مەبەستی خۆمان بە کوردی دەربڕین. هەندێ کاتیش وەڵامیان بریتی بوو لە چەند وشەیەک کە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندی نەبوو لەگەڵ بابەتەکەوە بۆ نموونە ئێمە (شۆڕشگێڕین). هەندێ کاتیش دەیان ووت: (ئێمە بە تورکی قسەدەکەین لەبەرخاتری هاوڕێ تورکەکان کە کوردی نازانن.) بەڵام لە بنچینەدا هیچ لەم بیانووانە نابنە بەربەست لەبەردەم ئاخاوتن بە زمانی کوردی. بێگومان بە تەواوی ڕوونە کە قسەکردن بە زمانی تورکی مانای شۆڕشگێڕێتی و نێونەتەوایەتی و سۆشیالیزم ناگرێتەوە. لێکدانەوەی تەواوی ئەم کارە مانای چۆک دادانە لە بەرامبەر زۆرلێکردنی ئیمپریالیزم و سیاسەتی تواندنەوەی ئەو کە ئەنجامی داوە. ئیمپریالیزمیش پێویستی بەم جۆرە کوردانە هەیە. ئەو کەسەی کە بە تورکی قسە دەکات و بەم زمانەش بیروڕای خۆی دەردەبڕێت و بایەخ بە کوردی نادات ئەوا هەلێکی باش بۆ ئیمپریالیزمی تورکی دروست دەکات تا بیڵێت: (زمانی کوردی زمانێکی سەرەتاییە و توانای دەربڕین بەم زمانە زەحمەتە. هەروەها لە بیرکردنی زمانێکی ئاوەها کارێکی پێشکەوتووخوازانەیە.) ئەم تێڕوانینە شۆفینێزمی و ئمپریالیزمیانەیە. بەڵام بێ شک هەڵوێستی کوردەکان

یاریدەدەری ئەم بانگاشەیە بوون بابەتی نەتوانینی ڕادەربڕین بە کوردی دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی کوردی لەکاتی ئاخاوتن‌و نووسین‌و خوێندنەوەدا. سەرەڕای ئەمەش لە ساڵی ١٩٧٢ بەرگری کردن لە زمانی کوردی بەشێوەیەکی ڕامیاری‌و ئایدیۆلۆژی‌و هەموو توانایەکەوە ئەنجامدرا. بە کاردانەوەیەکی بەهێز وەڵامی داواکاری گشتی لە دادگا درایەوە کە دەیوت: ( زمانی کوردی نییە. هەموو خەڵک تورکن. زمانی کوردی هیچ بوونێکی نییە.) بەندییەکان بە نووسراو سەربەخۆیەتی زمانی کوردی‌و بوونی گەلی کوردیان پاراست. ڕۆژێ لە ڕۆژان لەگەڵ چەند لە هاوڕێیانی زیندانی دوام‌و پێشنیارێکم خستە پێش چاویان (بەرگری لە زمانی کوردی‌و گەلی کورد بکەن لە دادگاو پێیان بڵێن کە کوردی زمانی سەربەخۆیەو کوردیش میللەتێکی سەربەخۆیەو داوای وەرگێڕ بکەن. ئەمە دەبێتە بەڵگەیەکی گەورە لە دادگاکان.) هاوڕێیان ئەم پێشنیارەی منیان پەسند نەکرد. هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە هەندێ هاوڕێیان زمانی کوردییان نەدەزانی‌و ئەوانەی کە کوردیشیان دەزانی بەس نەبوون. کەسێک نەبوو کە نووسین بە کوردی بزانێ‌و بە نووسراو بەرگری لە خۆی بکات. هەڵبەتە لە دادگاو وەڵامی داواکاری گشتی دەسلەمینەوە. لەهەمان کاتدا چەند کوردی دەرەبەگ بەندکرا بوون بە بیانووی ئەندامێتیان لە پارتی دیموکراتی کوردستان. بەڕای من ئەوان هەڵوێستیان پتەوترو سەختتر بوو. هەتا وەڵامی لاوە کوردەکانیان نەدەدایەوە کاتێ بە تورکی لەگەڵیان بدوابان. ئەوەش ڕەخنەیەکی ناڕاستەوخۆی ئەوان بوو بۆ ئەم هەڵوێستە خۆبەدەستەوەدەرە. ئیمڕۆش بار نەگۆڕاوە. دوو کورد ئەگەر تورکی بزانن لەگەڵ یەک بەم زمانە دەپەیڤن. هەتا شەڕی پارتیزانیش ئەم حاڵەتەی نەگۆڕاندووە. ئەمەش سەرنجی منی ڕاکێشاوە. بزووتنەوەی پارتیزانی کە زۆر گۆڕانکاری لە ڕووی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی وەدەست هێناوەو کۆمەڵگای

کوردەواری‌و ئایدیۆلۆژی‌و زۆر شتی‌تری لە بناخەوە گۆڕاند، ئایا چۆن لەبارەی زمان شتێکی ئەنجام نەداوە. بەڕاستی ئەمە سەیرە. مەسەلەی گۆڕینی ناوی گوندەکانیش پێویستە هەر لەم چوارچێوەیەوە سەیری بکرێ. هەروەک دەزانین گۆڕینی ناوی گوندە کوردییەکان پاش کۆدەتای ٢٧ی ئایاری ١٩٦٠ هاتە کایەوە. وا بڕیاردرا کە ناوە کوردییەکان بەکارنەهێنرێن‌و تورکی جێگایان بگرێتەوە. کوردەکان ئەمەیان بە مەترسی نەزانی‌و گۆڕانیش بە ئاسانی ڕوویدا. لە کۆتایی شەستەکان کە هێزی کۆماندۆی تایبەتی زۆرلێکردنیان لە کوردستان پەرەپێ دەدا، هەڤالان گوندەکانیان بە ناوی تورکی ناودەبرد یان ناوە تورکییەکانیان لە نێوان دوو کەوانەدا دەنووسی. ئەم کارە ئێستاش بەردەوامە هەتا لە بڵاوکراوەکانی PKKش. ئەمەش پلەی بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕووبوونەوە لەبەردەم سیاسەتی ئیمپریالیزمی تورکی دەردەخات. کوردەکان لە قەبارەی ئەم کارە کەم دەکەنەوەو بە بچووکی دەزانن‌و زۆر بایەخی پێ نادەن، بەڵام پەسەندکردن‌و قەبوڵکردنی ئەو شتانەی کە دەوڵەت یاساخی دەکات، دەبێتە یارمەتیدەری سیاسەتی تواندنەوە. بایەخ‌نەدان بە زمانی کوردی دەبێتە هۆی بایەخ‌نەدان بە کەلەپووری میللەتیش. من بڕوا دەکەم: کوردەکان بەشێوەیەکی چاک‌و ڕێکوپێک گۆرانی ناچڕن. کۆرس بەکارناهێنن لەکاتی گۆرانی چڕیندا. ئامێری مۆسیقی جۆربەجۆر بەکارنابەن. هەڵپەرکێیە کوردییەکان کە زۆرو جۆراو جۆرن نایزانن. ئەو کوردانەی کە من لە زیندان ناسیومن ئا بەم جۆرەن، ئەگەرچی لە ڕۆشنبیرەکان بوون. منیش ئەوە دەزانم کە گوندییە کوردەکان لەوانە جیاوازن.

لەم بارەیەوە جیاوازییەکی بەرچاو نابینرێت لە نێوان ١٩٧١و١٩٩٠. هەمووشتێک وەک جارانە. چونکە کوردەکان بایەخ بە زمان‌و کەلەپووری میللی نادەن‌و بچووکیان دەکەنەوە. بۆ بایەخ بەم

مەسەلەیە نادەن؟ ئەوان بایەخ بە هیچ شتێک نادەن. سیاسەتی ئیمپریالیزم لەم بارەیەوە ئامانجی خۆی پێکاوە، هەڵبەتە لەکاتی ئێستادا ئەوەی کە بۆ تورک گرنگە بۆ کوردیش گرنگە. کوردەکان دوای تورکەکان ڕێ دەکەن‌و بە لاسایی کردنەوەی تورکەکان دەیانەوێ بوونی خۆیان بسەلمێنن. وەکو تورکەکان مۆسیقا لێدەدەن‌و گۆرانیش بە تورکی دەنووسن‌و هەر بەم جۆرە...

بێجگە لە زمان‌و بیر... زمان‌و ناوەڕۆکی بیر بە شێوەیەکی ئۆرگانیکی گرێدراون. کە بە تورکی قسە بکەی بە تورکیش بیردەکەیەوە. واتا تۆ وەک تورکەکان بیردەکەیەوە. بیری مەسەلەی کورد بە تورکی دەکەیەوە. کە بە کوردی قسە بکەی ئەوکاتە بە کوردی بیردەکەیەوەو وەک کوردێکیش. بیرکردنەوە لە مەسەلەی کورد وەک کوردێک یا تورکێک کارێکی گرنگە. ئایدۆلۆژیەتی ڕەسمی تورک لەگەڵ کاتدا خۆی بەدیار دەخات لەژێر کاریگەری هەست کردن بە بیرکردنەوەی تورکی یاخود شوێنی خۆی جێ دەهێڵێ. لەبەر ئەوە بایەخدان بە زمانی کوردی کارو ئەرکێکی پێویست‌و بەپەلەیە. ناتوانرێت ئەم ئەرکە وەدوا بخرێت. ئەرکی کوردەکان گەلێکن. قسە کردن‌و نووسین‌و نووسین بە کوردی یەکێ لەم ئەرکانە دەگرێتەوە.

ب- لەم خاڵەدا دەمەوێ دەستنیشانی فرمانێکی بناخەیی‌تر بکەم. ئەویش پێویستیەتی شیکردنەوەو توێژینەوە زانستییەکان لەسەر کوردستان. ئەو کەسانە یا دەزگایانەی لێکۆڵینەوە لەسەر کوردستان ئەنجام دەدەن پێویستە خاوەن ئەقڵێکی سەربەخۆی تەواو بن. پێویستە بیروباوەڕی ئەو کەسانە یا دەزگایانە سەربەخۆ بێ. پێویستە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی مەسەلەی کوردو مێژووی کوردو بنەمای کۆمەڵگای کوردەواری‌و زمان‌و فەرهەنگی کوردی‌و چەندەهای‌تر ئەنجام بدرێن، سەرەڕای ئەو مەترسیانەی کە لە ئەنجامی ئەو کارەوە دروست

دەبن، چونکە زانیاری ئێمە دەربارەی کوردستان کەمە. ئەو زانیاریانەی کە هەمانە پڕە لە هەڵە، چونکە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان ئەوەی لەدەستیان بێ کردوویانە لە پێناوی سەلماندنی نەبوونی کوردەکان‌و بزرکردنی هەموو شوێنەوارێکی مێژوویی‌و فەرهەنگییان. ئەو بەڵگەنامانەی کە لەسەر کورد هەبوون هەموویان سوڕگوم کرد. لەلایەکەوە نکۆڵی لە بوونی کورد دەکەن‌و لە لایەکی‌تریشەوە ئەو بەڵگەنامانەی کە تایبەت بوون بە کوردەکان هەموویان سووتاند یا فەرامۆشیان کردووە. پاشماوە کۆنەکانیان دزی‌و لەناو برد. هەموو هۆیەکیان بەکارهێنا بۆ سڕینەوەی مێژووی کوردو کوردستان‌و هێشتنەوەیان لە تاریکی. بۆ ئەم کارەش یەکتریان بێ یارمەتی نەکرد. ئەرکی کوردەکان لەم کاتەدا بێگومان هەستانە بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەموو بوارێک‌داو بە هەموو توانایانەوە. ئەوکەسەی پێویستی بە زانیاری دەبێت، هەر ئەوە کە زانیاری دروست دەکات‌و پێویستی کوردەکان بۆ زانیاری گەلێ زۆرە. لەبەر ئەوە کوردەکان دەبێ خۆیان زانیاری تایبەت بە کوردستان بهێننە ئاراوەو پێویستە مێژووی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سەرلەنوێ بنووسرێتەوە. پێویستە مێژووی تورکیاو ئێران‌و عێراق‌و سوریاو لوبنان‌و فەلستین سەرلەنوێ بنووسرێنەوە. هەر کوردەکانن توانای ئەم کارەیان هەیە چونکە کوردەکان بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەست‌دایە لە هەمووان زیاتر زەرەریان لێکەوتووە. نووسینەوەی سەرلەنوێ کێشی ڕامیاری‌و کۆمەلایەتی‌و بەرژەوەندی کوردەکانیش دەگرێتە خۆ. پێویستە لەسەر کوردەکان هەر لەئێستاوە دام‌و دەزگای خۆیان دابمەزرێنن. پێویستە پشتگیریان بکرێت تاکو بتوانن لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە بە ئەقلیەتێکی سەربەخۆ ئەنجام بدەن. سوور بوون لەسەر ئەقلیەتی سەربەخۆ کارێکی زۆر گرنگە بۆ کوردەکان. لەدوایی‌دا لە تواناداا نابێ

کە نەبوونی هێزی سیاسیو سەربازی مەزنی کوردەکان پشتگوێ بخرێت. ئەو هێزەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت. لەکاتی ئێستادا هەندێک دەوڵەت هەن کە یارمەتی هەندێ لە بزووتنەوە کوردییەکان دەدەن، پێویستە بە ئەقڵیەتێکی سەربەخۆ ڕەخنە لەم پەیوەندییانە بگرین. چونکە یاریدەدانی دەوڵەتێک مانای ئەوە ناگەیەنێ کە نابێ ڕەخنەبگرین. پێویستی بۆ خەباتە زانستییەکان بە شێوەیەکی گشتی دێتە ئاراوەو بە تایبەتی کاتێ کە پێشکەوتنو دەرک کردنی مەسەلە کۆمەڵایەتیو ڕامیارییەکان دێنە مەیدانەوە. هەڵبەتە لێکۆڵینەوە ئەم دەرک کردنە دەوڵەمەند دەکات. پێویستە لەسەر بنکە سیاسییەکان لە کوردستان یارمەتی دەزگا هاوکارەکان بدەن تاکو بتوانن بە ئازادی لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوە ئەنجام بدەن.

ج- پێویستە کوردەکان خاوەن ڕای تایبەتی خۆیان بن دەربارەی مێژوو و کۆمەڵو جیهان. پێویستە لەسەر کوردەکان بە تێڕوانینی تایبەتی خۆیان لە مێژووەو کۆمەڵو جیهان بنۆڕن. تێگەیشتنی کوردەکان بۆ مێژوو و کۆمەڵ جیاوازی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی تورکو عەرەبو فارس. هەروەها تێڕوانینی کوردەکان جیاوازە لەگەڵ ئەوان بۆ مەسەلە ڕامیاریو کۆمەڵایەتییەکان بۆ نموونە پەیماننامەی لۆزان کۆیلەتیەکی تەواوە بۆ کوردەکان. بەپێی پەیماننامەی لۆزان کوردستان دابەشو پارچە پارچە کرا لە نێوان چەند وولاتێکدا. هەر بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە کوردەکان بوونە کۆیلەو نموونەی ئەمەش لە هیچ شوێنێکی تری جیهاندا نابینرێت. بەلاّم پەیماننامەی لۆزان بۆ تورکەکان مانایەکیتر دەبەخشێت. لۆزان بۆ ئەوان مانای سەربەخۆبوونو بنیاتنانەوەیە. واتا دروست کردنی دەوڵەتێکی بەهێز لەسەر پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. واتا دەرکردنی دەستدرێژکەران لە ئەنادۆڵو گەڕانەوەی ئازادیو سەربەخۆیی بۆ تورکەکان. هەتا تورکە شۆڕشگێڕو

مارکسییەکانیش هەر بەو مانایە لە لۆزان دەگەن. لێرەدا بایەخی ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێت کە دەبێ کوردەکان خاوەن ڕای تایبەتی خۆیان بن. هەر بە هەمان پێوەر دەتوانین مەسەلەی قەسابخانەی ئەرمەنەکان بهێنینە گۆڕێ. تورکەکان‌و ئەرمەنەکان بەشێوەیەکی جیا لەیەکتر بیردەکەنەوە. هەروەها عەرەب‌و فارسەکان بە ڕێگای جیاواز دەربارەی جەنگی عێراق - ئێران بیر دەکەنەوە.

هەندێ کات ڕەخنە لە بیرۆکەی ناوبراو دەگرن‌و دەڵێن: (لەوکاتەی مێژوو نووسراوە کورد هیچ بوونێکی نەبووە. نکوڵی لە بوونی کورد کراوە تا ئێمڕۆش. بەڵام ئێستا هەوڵدانێکی بە پێچەوانە لەگۆڕێدایە...) بێ شک ئەمە هەڵەیە. چونکە کوردەکان نکوڵی لە بوونی کەسێک ناکەن. بوونی تورکەکان‌و عەرەبەکان‌و فارسەکان دەسەلمێنن‌و هەتا هەوڵی ئەوە دەدەن جێگای مێژوویی ئەوان بگرنەوە. دەیانەوێ ئەوە بڵێن کە نەسەلماندنی ۳۰ ملیۆن کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەکارێکی زانستی ناژمێردرێت لەبەر ئەوە تێڕوانینی کوردەکان بۆخۆیان‌و مێژوویان‌و کۆمەڵگایان جیاوازی دەبێت لەگەڵ تێڕوانینی تورکەکان‌و عەرەبەکان‌و فارسەکان. خۆچەکدارکردن بەم جۆرە تێڕوانینەو تێگەیشتنە هیچ مەترسیەکی نابێ بۆسەر کەسێک. کاتێ مرۆڤ لە مێژووی کوردەکان وورد دەبێتەوە دەبینێ چۆن ئادەمیزادی کوردو گەلی کورد بە درێژایی مێژوو بوونەتە کۆیلەو ئەم کۆیلەتیەش تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە. ئەم مێژووە مێژووی کۆیلایەتییە بەڵام ئیمڕۆ کوردەکان ئەم کۆیلایەتییە قاوەدەدەن‌و پێویستیەتی نەهێشتنی ئەم نەنگییە دەرک پێدەکەن‌و بەو هەست کردنە،هەنگاو دەنێن بەرەو مێژوو و کۆمەڵگا. لێرەدا بە پلەی یەکەم ئازادی بیر دێت. پێویستە هەر مرۆڤێک ئازاد بێت لە دەربڕینی بیرو ڕای خۆی‌و ڕەخنەگرتن. بیرکردنەوە لەم بابەتە بەوجۆرە هیچ زیانێکی نابێت بۆ مەسەلەی

کوردی. بوونی مەترسی ئازادی بیر لە مەیدان ڕادەکات. زانکۆکانی تورکیاو مامۆستا تورکەکان‌و ڕاگەیاندنی تورکی‌و لێکۆڵەرەوە تورکەکان لایەنگری تورکەکان دەگرن. کاتێ دەڵێن: چەند شادە ئەوکەسەی کە تورکە، ئابەم ووتەیان بوونی کوردەکان ناسەلێنن، ئەوان ئازادی بیریش ناپارێزن. بیری بەرهەڵست تووشی لێپرسینەوە دەبێت. هەتا بەرهەڵستی سزادانی بیریش ناکەن‌و مەترسییش لەم خاڵەدایە.

پێویستە کە شۆڕشگێڕە تورکەکان مێژووی کوردو کۆمەڵگای کوردەواری وەک کوردەکان سەیر بکەن. ئەم پێویستیەش ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیاد بووندایە. کاتێ کە کۆمۆنیستی تورکی (ئیبراهیم کایپاککیا) لە دابەشکردنی کوردستان بەپێی ڕێکەوتننامەی لۆزان دەکۆڵێتەوەو ئەم دابەشکردنە بە زوڵم دەزانێت‌و دەبێژێت: ئەم زۆر لێکردنە کۆن بووە ناتوانین ئەمڕۆ لێی بکۆڵینەوە.) بەمە ڕێ لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەلأیەتی‌و کێشەی چینایەتی دەگرێت.

لەبەر ئەوە کۆمۆنیستەکان نابێ لەبەرامبەر ئەم مەسەلەیەو نەهێشتنی ئەم دەستدرێژکارییە بوەستن. ئەمەش کارێکی ئاقلأنە نییە. بزووتەوەی کۆمۆنیستی تورکی لێپرساویەتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی تەنیا لە چوارچێوەی سنووری تورکیا دەگرێتە ئەستۆ. پارتە کۆمۆنیستییەکان لە عێراق‌و ئێران پێویستە بەپێی باری خۆیان چارەسەر بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزنەوە. تا لەم کاتەدا زوڵم نامێنێت)
:مختارات- هەڵبژاردەکان. ل: ٢١٥-٢١٧.

هەڵبەتە کوردەکان بەم شێوەیە بیرناکەنەوە. (باشترین چارەسەر، بەپێی تێڕوانینی کوردی چارەسەر نییە. کوردەکان ئەوە دەزانن. نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئیمپریالیزم کوردستانی دابەش‌و لەت لەت کردووە. بەرژەوەندی‌و داوای کوردەکان دەبێ لەبەر چاوبگیرێ. کوردستان لەسەر دەستی ئیمپریالیزمی فەرەنسی‌و ئینگلیزی‌و

کەمالیستەکان‌و میرنشینە عەرەبەکان‌و فارسەکان پارچە کراوە. کوردەکان بەم دابەشکردنە دەزانن‌و ڕەتی دەکەنەوە. شۆڕشگێڕە تورکەکان بەم کارە نازانن‌و تێی ناگەن لەبەر ئەوە کارەکە پەسند دەکەن. ئیبراهیم کایپاککیا بەتەنێ بەم جۆرە بیرناکاتەوە بەڵکو زۆری‌تر هەن کە بە هەمان شێوە یا زیاتر یا کەمتر بیردەکەنەوە بۆ نموونە: مەهری بللی، ماهر حایان، محمد علی ئەیبار، دنیز گزمیش، حیکمەت کیفلجملی، دوغان اڤجی اوغلوو بهیج بوارن. کارلێکردنی کەمالیەت لەسەر چەپی تورکی زۆر ڕوون‌و ئاشکرایەو پێویست بە گفتوگۆ کردن ناکات. رزگار بوون لەم کارلێکردنەش ئاسان نییە. بۆ نموونە کاتێ ئیبراهیم کایپاککیا ڕەخنە لە مهری بللی دەگرێ دەربارەی مەسەلەی نەتەوەیی‌و بە کەمالیستی ناو دەبات، بۆخۆشی لەم کارلێکردنە بەدەر نییەو سەربەخۆ بیر ناکاتەوە. کەواتە پێویستە شۆڕشگێڕە کوردەکان بۆ هەر مەسەلەیەک کوردانە بیر بکەنەوەو ڕێگاو شێوازی خۆیان بە خۆیان هەڵبژێرن‌و توانای خۆیان بەرەوپێشەوە ببەن. دەتوانین ئەوەش بڵێین کە بیروڕای شۆڕشگێڕە تورکەکان بۆ مەسەلەکان نازانستانەیە. لە هەمان کات‌دا بیروڕای شۆڕشگێڕە کوردەکان زۆر زانستانەیە. چونکە هەروەک ووتمان ئەو کەسەی کە پێویستی بە زانست هەیە هەر خۆیەتی کە دروستی ئەکات‌و دەیهێنێتە مەیدانەوەو پێویستی کوردەکان بۆ زانین گەلێکە. کوردەکان زۆرتر زەرەرمەندن لەوەی کە نووسراوەو ڕوویداوە. شۆڕشگێڕە تورکەکان بە ئاسانی لە کەمالیەت رزگاریان نابێت. ئەو نووسراوانەی کە دەربارەی مێژوو و باری ئێستا دەردەچن ناڕەحەتی شۆڕشگێڕە تورکەکان ڕادەگەیەنن. لەبەر ئەوە ساویلکەییە کە چاوەڕوانی تورکەکان بکرێت تا سەرلەنوێ مێژوو بنووسنەوە. ڕەخنەگرتنی سەرانی شۆڕشگێڕانی تورکیا لە کەمالیزم‌و قەبوڵکردنی چوارچێوەی گشتی کەمالیزم ئەم شتەی سەرەوە بەدیار دەخات، نەبوونی توانای چاوەڕوانی.

پێویستە کوردەکان لە هەندێ مەسەلە بنۆڕنو ڕەسوای بکەن. بۆ نموونە بۆنەی ۲۳ی نیسانی میهرەجانی منالاْنو ۲۹ی تشرینی یەکەمی دامەزراندنی کۆمارو ۳۰ی ئەیلولی ڕۆژی سەرکەوتن بەسەر یۆنانو ۱۹ی ئایاری جەژنی وەرزشو لاوانو زۆر بۆنەی‌تر کە بە بۆنە کوردییەکان ناژمێردرێن. ئەو بۆنە نەتەوەییانە بۆنەکانی دەوڵەتی ڕەگەزپەرستو ئیمپریالیزمییە. بەهۆی یاساو فرمانەکان کوردەکان ناچار دەکەن کە ئاهەنگ بەم بۆنانەوە بگێڕن. کوردەکان ئەم ساڵ هەستیان بەم کارە کردووەو هەوڵ دەدەن بەشداری بۆنە نەتەوەییەکانی ڕەسمی دەوڵەت نەبن. ئەمانە بۆ کوردەکان بۆنە نین. ئەوانە بۆنەی مێژوویین کە کوردەکانیان کردە کۆیلە. هەر بە هۆی ئەمانە کوردستان کرا بە موستەعمەرەی نێو دەوڵەتان. جەژنی نەتەوەیی کوردی دەکەوێتە ۲۱ی ئازار. کوردەکان سەرەڕای هەموو شێوەیەکی زۆرلێکردنو سەرکوتکردنو دامرکاندنەوە ئاهەنگ بەم بۆنەیەوە دەگێڕن.

لێرەدا خاسیەتێکی تریش لە کوردستان دەبینرێ. وەک رزگارکردنی ماردین، رزگارکردنی هەکاری لەژێر دەستی داگیرکەران، رزگارکردنی بەدلیسو وان لە دەستدرێژکەران. ئەمە گەمە بەخۆ کردنە. گەمە بە خۆکردنی مێژووە. لەم ڕۆژانەی ئێستادا کوردستان لەبن دەستی دوژمنان رزگار نەکراوە. بەپێچەوانەوە کوردستان کەوتە ژێر دەستی دوژمنێکی نوێو ئەویش دوژمنی تورکییە. بێجگە لەمانە دوژمنایەتیو داگیرکردنی نوێ زۆر لە جاران دڕندانەترو خوێناوی‌ترە. مرۆڤ لە هیچ شوێنێک ئەم دڕندانەیەتیو کۆنەپەرستییەی بەرچاو ناکەوێت. چونکە کوردستانو گەلی کوردیان داگیرکردو شوێنەواری ماددیو مەعنەویان نەهێشت. داگیرکردنێک کە ناویشیان لەسەر ڕووی جیهان سڕییەوە. داگیرکردنو دەستبەسەراگرتنو ئیمپریالیزم شان لە شانی یەکدان لە کوردستان. کوردستان لە ڕووی سەربازیو

ڕامیارییەوە زەوت کراو ئێستاش نۆرەی ئیمپریالیزمی ئابوورییە، دەڵێن: (لەژێر دەستی دوژمنان ڕزگارمان کرد)...

لەڕاستیدا ئەگەر کوردستان لەژێر دەستی داگیرکەرێکیتردا بایە بۆ نموونە وەک ئیمپریالیزمی ئینگلیزی ئەوا لە مێژەوە ڕزگاری بوو بوو. هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمیتر بەو تێکدانە هەڵنەدەستا کە داموو دەزگای تورکی ئەنجامی داوە. چونکە ئیمپریالیزمی تورکی هێرشی کردۆتە سەر هەموو نرخو بنەمایەکی مرۆڤی کورد. کەرامەتو ئابڕۆی کوردیان خستە ژێر پێی خۆیان. مرۆڤی کوردیان ڕووخاند. هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمی لە چ شوێنێکیتری جیهان وەکو ئەوانیان نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەت سیاسەتی ئیمپریالیزمیانەی خۆی دەشارێتەوە لەژێر پەردەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەو جەژنەکانی بەناو (سەربەخۆ بوون). هەرچەند زیاتر مێشکی کوردان بکرێتەوەو بنجو بناوانی ئەو مەسەلانە بزانن ئەوا پیسێتی ئیمپریالیزمی تورکی لە هەموو ڕوویەکەوە دەردەکەوێت.

داگیرکەران دەڵێن (جودا خوازەکان)، (ناپاکانی نیشتمان) ئای چەند تێگەیشتنێکی هەڵەیە. سەپاندنی ووشە یا وەسفی جوداخوازی بەسەر کوردەکان هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە کوردەکان نیشتمانی تورکەکان (تورکیا) پارچە پارچە ناکەن، بەڵکو بەرگریو پارێزگاری لە نیشتمانی خۆیان کوردستان دەکەن. ئەوان داوای ڕزگارکردنی خاکەکەیان دەکەن کە لەت لەت کراوەو بۆتە کۆلۆنی نێو دەوڵەتان. لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە جوداخوازە سەرەکییەکان ئیمپریالیزمی فەرەنسیو ئینگلیزیو کەمالیستەکانو میر نشینە عەرەبو فارسەکان بوون. ئەوان جوداخوازی ڕاستەقینەن، پارمەتی یەکتریان داو کوردستانیان دابەشکرد. ئیمپریالیزمی تورکی کوردەکان بە جوداخوازی تاوانبار دەکاتو بە خۆشی بە نهێنی هاوکاری لەگەڵ

ئیمپریالیزم دەکات‌و دەیەوێت ڕاستی مێژوویی بشارێتەوە لەبەر چاوان. ئیتر دەوڵەت ناتوانێت سیاسەتی دوو ڕووانەی خۆ لەمەولا بەردەوام بکات.

پێویستە هەر لەم گۆشە نیگایەوە مەسەلەی (ناپاکی نیشتمان) هەڵسەنگێنین. کوردەکان بەرگری لە نیشتمانی خۆیان دەکەن‌و هەوڵی ڕزگارکردنیشی دەدەن لەبن دەستی ئیمپریالیزم، لەبەر ئەوە ئەوان نیشتمانپەروەرن. هەڵبەتە لە کوردستان خۆفرۆشان‌و ناپاکان هەن‌و ئەوانیش ئەوانەن کە هاوکاری لەگەڵ ئیمپریالیزمی تورکی دەکەن لەدژی وڵات‌و گەلی خۆیان. دەزگای ڕاگەیاندن‌و ڕۆژنامەو زانکۆکان‌و پارتە سیاسییەکان‌و ئیمپریالیزمی تورکی هەموو کارو کردەوەیەک ئەنجام دەدەن لەپێناوی شێواندنی ناوەڕۆکی ئەم چەمکانە، بەلاّم سپی لە ڕەش جیا دەبێتەوەو کێشەکەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕوون دەبێتەوە. هێزە دەستدرێژکەرەکان، وە پاشان هێزە نیشتمانییەکان کە بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە خاوەن تێڕوانینی تایبەتی‌و جیاوازن دەربارەی ناپاکی‌و فرۆشتنی نیشتمان.

د- لێرەدا مەسەلەیەکی تر لە گۆڕێدایە کە پەیوەندیدارە بە جەوهەری کێشەی کوردی‌و پێویستە هەڵوەستەیەکی بۆ بکەین. کێشەی کوردی کێشەیەکی نێو دەوڵەتانە. ئەمەش بەری ئەو بارەی ئێستای کوردستانە بەهۆی دابەشکردن‌و پارچە پارچە کردن. لەلایەکی تریشەوە چونکە وڵاتانی وەکو وڵاتە یەکگرتووەکان‌و یەکێتی سۆڤیەت‌و بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیا گفتوگۆو لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی کوردی دەکەن. ئەو کۆبوونەوانەو پێک گەیشتنانەی کە تا ئێستا ئەنجام دراون دوو قۆڵی‌و نهێنی بوونە: لەنێوان تورکیاو عێراق - تورکیاو ئێران -تورکیاو سوریا. لەنێوان ئێران‌و عێراقیش‌دا پێک گەیشتنی دوو قۆڵی‌و نهێنی ئەنجام دراوە. زۆر ڕوونە کە نوێنەرایەتی کوردەکان لەو

بەیەک گەیشتنە دوو قوڵیو نهێنییانەدا نەبووە. بێجگە لە نەبوونی نوێنەری کوردەکان، لەم چاوپێکەوتنە دوو قوڵییانەدا نەخشەی زۆر پیلانو یاری تازە دژی کوردەکان ئەنجام ئەدرێت. لەبەر ئەوە نێونەتەوەیی کردنی کێشەی کوردیو باسکردنی لە داموو دەزگا دەوڵەتییەکان کارێکی بایەخدارە. ئەمە مەسەلەی کوردی لە ڕووی ئایدۆلۆژیو ڕامیاری پێش دەخاتو پەرەی پێ دەدات. پێویستە کوردەکان نوێنەریان هەبێت لەم دەزگایانەو ڕای خۆیان لەوێ دەربڕن. بێگومان ئەم دەزگایانەش دۆستی کوردەکانی هەر تێدا دەبێت.

دەمەوێ جەخت بکەمە سەر قسەکەم: کێشەکە لە پەرلەمانی ئەورووپی، ئەنجومەنی ئاسایشی ئەورووپی، ڕێکەوتننامەی هێلسنکی ئەم دواییە، ڕێکخراوی لێبووردنی جیهانیو زۆر دامەزراوی‌تری نێودەوڵەتان باس دەکرێت. هەندێک کات ئەم کێشەیە لە هەندێ پارلەمانی وولاتاندا گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، کاتێ لێدوانو لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کوردی لە کۆنگرێسی ئەمریکی، پەرلەمانی فەرەنسیو پەرلەمانی ئینگلیزی ئەنجام بدرێتو پێشنیار دەربارەی ئەم مەسەلەیە بێتە ئاراوە، ئەم شتە دەبێتە هۆی پرسیارکردنی خەڵک: دەوڵەتان دووبارە پیلان دژی کوردستان ئامادە دەکەن؟ ئایا بۆ توێژینەوە لەسەر کێشەی کوردی دەکەنو چ کەمەیەکی نوێیان بەدەستەوەیە؟ بە بڕوای من پێویستە پیاو زۆر بە ووردبینی لەم کارانە بڕوانێت.

بێگومان ئیمپریالیزم ڕۆڵی خۆی هەیە لەسەر کێشەی کوردی. ئەم ڕۆڵە لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم، نێوان سالانی ١٩١٥-١٩٢٥ زۆر بە گورجی هاتە مەیدانەوە. دابەشکردنو پارچە پارچە کردنی کوردستان هەر لەم سالانەدا ڕوویداو بە یارمەتیو نەخشەکانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزیو فەرەنسیو کەمالیستەکانو میرنشینو شێخ نشینە عەرەبو فارسەکان. ئەمەش گەورەترین نموونەیە لە مێژوو کە

سیاسەتی ناکۆکی خستنەوەی ئیمپریالیزمی تیادا ئەنجام درابێت. بەرهەمی ئەم سیاسەتەش زۆر گران کەوت. ئەم سیاسەتی ناکۆکی‌نانەوە دۆستی کوردەکانی گەیاندە ڕادەیەک کە زۆر کەم بۆوەو دوژمنانیش زۆر زۆر بوون. ئەو سیاسەتەی کە دوژمنانەکانی دڕندەترو دۆستەکانی گەلی کوردی بەرەو خراپی برد.

کاریگەری ئیمپریالیزم لەسەر مەسەلەی کوردستان لەو ماوەیەدا ڕۆلی خۆی گێڕا. پێویستە تۆژینەوەی مەسەلەی دابەشکردن‌و پارچە پارچەکردنی کوردستان‌و بارودۆخی کوردستانی ئەمڕۆ لەسەر بناخەی ڕاستییەکان وە بە درێژی ئەنجام بدەین. مەسەلەی گفتوگۆکردن لەسەر کێشەی کوردی‌و پێشنیاری پەرلەسانە دەوڵەتییەکان دژ بە بەرژەوەندی کوردەکان ناوەستێت. ئەم کردارە ئەو دەوڵەتانە بێزار دەکات کە کوردستانیان کردۆتە کۆلۆنی نێو وولاتان‌و بەشێوەیەکی هاوبەش تێدەکۆشن تاکو کوردستان لەژێر دەسەلاتیان بهێڵنەوە. بۆ نموونە دەگۆترێ (وولاتە یەکگرتووەکان، فەرەنساو بەریتانیاو ئەلمانیا باسی کێشەی کوردی دەکەن‌و هەوڵی خۆپاراستن‌و بەدەستهێنانی مەزنترین بەشی کێکی کوردی ئەدەن.) ئەو ووتانە دەبێتە هۆی بیرکردنەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

کوردەکان لەکێکی خۆیان بێبەش دەکەن‌و لە نێوان خۆیان دەیبەخشنەوە... بەلام هەلومەرج بە تەواوی جیاوازە. چونکە کێکە کە ئێستا لەژێر ڕەحمەتی ئیمپریالیزمی تورکی‌و عێراقی‌و ئێرانی‌دا دەپلیشێتەوە. بۆ نموونە سەددام حوسێن لە پارچەیەکی ئەم کێکە چەکی کیمیاوی دروست کردو فرۆکەی مێک‌و سۆسلۆفی کڕی‌و بەم چەکانە هێرشی بردە سەر کوردەکان. تورکیاش پێویستی بەوەنییە کە ڕای کوردەکان بزانێت دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئاوی دیجلەو فورات. بەکورتی کوردەکان کێکێکی کوردی شک نابەن. بەلام گەیشتنی

مەسەلەی کوردی بۆ دامو دەزگا جیهانییەکانو گفتوگۆ کردنو لێکۆڵینەوەی لەوێدا بە قازانجی کوردەکانە. لێرەدا جۆرە نارەحەتییەک پەیدا دەکرێ دەربارەی گۆڕینی مەسەلەکە بۆ مەسەلەیەکی کولتوریو گەیاندنی زیان بە خەبات لە پێناوی سەربەخۆیی یا دواخستنی، هەڵبەتەو پێویستیشە کە ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەک گفتوگۆی لەسەر بکرێ لەبەردەم دامەزراوە دەوڵەتییەکان کە یەکبگرنەوە لەگەڵ خەباتی چەکداری لە کوردستانو تێکۆشین لە پێناوی ئازادیو سەربەخۆیی.

دابەشکردنو پارچە پارچە کردنی کوردستان بارودۆخێکی تایبەتی دروست کردووە هەر لەبەر ئەم بارە تایبەتیەشە کە سەربەخۆیی تەواوی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانو خەتی شۆڕشگێڕی بە زەحمەت ئەنجام ئەدرێت. چونکە سەرانسەری کوردستان لەژێر داری زۆردارو وابەستەبووندا دەناڵێنێت. کوردستان بە دوژمنو هێزەکانییەوە چواردەورە دراوە. هەر چ کاتێک ئەو ڕێکخراوانەی، کە شەڕی رزگاری کوردستان دەکەن، میکانیزمی دابەشکردنو لەت لەتکردنیان دەرک پێکردو هەرچ کاتێک هەستو نەستی کۆمەڵایەتیو مێژوویان گەشەی کرد، ئەوکاتە زۆرتر توانایان دەبێت بۆ دروست کردنی خەتو ڕێبازێکی سەربەخۆ. بەرژەوەندی بناخەی هەر شتێکە لە پەیوەندی نێو دەوڵەتاندا. بەرژەوەندی فرمانێکی ناوەندییە لە پەیوەندییەکاندا. هیچ ڕێکخراوێک یا دەوڵەتێک نییە کە یارمەتی پێشکەش بە هێزەکانی بزووتنەوە ئازادیخوازەکان بکات لەپێناوی دادپەروەریو بیروباوەڕدا، بەڵکو بە دڵنیاییەوە بیر لە بەرژەوەندی خۆشی دەکاتەوە. بێگومان ئەوان چاوەڕوانی کاردانەوەیەکن کاتێ کە هاریکاریو پشتگیری بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی دەکەن. پێویستە لەسەر بزووتنەوە ئازادیخوازیو شۆڕشگێڕییەکان کە بەووردی حیسابی ئەم پەیوەندییانە بکەن. پەیوەندییەکان بە حیساب کردنە. دەتوانرێت پەیوەندی

سازیکرێنت‌و ببەسترێنت ئەگەر جۆرە هاوکێشییەک لە ئارادا بێت. لەتوانادا نییە کە بەرێوەبەرایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی‌و نەتەوایەتی کوردستان لە ناوەندە ئەورووپییەکانەوە بەرێوەببردرێت. هەڵبەتە مانەوە لە ناوەندە ئەورووپییەکان‌و کردنەوەی نووسینگە لەوێ بەکاری گرنگ دەژمێردرێن، بەڵام بەمەرجی بوونی بنکەکانیان لەنێو خودی کوردستاندا. تا لەم کاتەدا بەری خەبات وەدی دێت. لەهەمووی گرنگتر ئامادەبوونە لەسەر گۆرەپانی کوردستان یاخود نزیک بوونەوە لە کوردستان بە چاکترین پلەو بەپێی توانا. هەروەک لەسەرەتاوە ووتمان مەسەلەی پەیوەندییەکان بە حەساب کردنە. پەیوەدنییەکان مەترسییەک ناهێننە ئاراوە ئەگەر جۆرە کێش‌و پێوان‌و هاوکێشییەک هەبێت.

هـ- چالاکی زانستی جیاوازە لەگەڵ چالاکی رامیاری. بەبێ دان‌و ستاندن چالاکی سیاسی ئەنجام نادرێت. هەندێک جار دوژمن چۆک دەداو هەندێک جاریش تۆ بۆ دوژمن. سیاسەت بەم شێوەیە گەشە دەکات. لە زانستدا چۆک دادان نییە. پێویستە چەمکەکان (سەبک) لەشوێنی راستی خۆیاندا دابنرێن. پەیوەندی نێوان دیاردەکان بەشێوەیەکی ساغ بنیات دەنرێن. نابێ دیاردەکان نەبینرێن یا چاوپۆشییان لێ بکرێ. پێویستە لەسەر ئەوانەی کە بە لێکۆڵینەوەو لێتوژینەوە رادەبن بە تەواوی سەربەخۆو ئازاد بن لە رووی ئەقڵی‌و بیرکردنەوەیان. نابێ هیچ چۆک دادانێک ئەنجام بدرێت لەم بوارەدا. لەبەر ئەوە پێویستە جیاوازی بەدیار بخرێ لەنێوان ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی زانستی رادەبن‌و ئەوکەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی رامیاری رادەبن. هەروەها پێویستە لەسەر ئەوکەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی رامیاری رادەبن خۆ دوورەپەرێز بگرن لە سەرکردایەتی ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی زانستی رادەبن. ئەو کەسانەی کە بە چالاکی زانستی هەڵدەستن پێویستە سەربەخۆیەتی

خۆیان بپارێزن لەبەردەم دامەزراوە سیاسییەکاندا. ئەم هەڵوێستە بۆ کوردەکان زۆر پێویستە.

و- پێویستە هەڵوێستەیەک لەسەر چەمکی (نەتەوە)ی کوردیش بکەین. نەتەوەی کورد جیاوازە لەگەڵ نەتەوەی تورک و عەرەب و فارس. ئەم جیاوازییەش زۆر گەورەیەو بە رادەیەک ناتوانرێ یەکێتی لە نێوانیاندا سازبکرێت. نەتەوە لە ئەورووپاو جیهانی رۆژئاوادا بووەتە (تەیار)ێکی ناهاوچەرخ. لەهەمان کاتدا نەتەوە هێشتا زۆر بەهێزە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیاو ئەفریقاو شوێنە لەیەکچووەکانی تریش. هەر بۆ نموونە تا ئێستاش هەستی نەتەوەیی و بزووتنەوە نەتەوەییەکان گەلێ بەهێزن لای عەرەب و تورک و فارسەکان. ناوەڕۆکی ئەم بزووتنەوانەو ئایدیۆلۆژیانە جیاوازییەکی مەزنیان هەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی نەتەوەی کورد.

کوردەکان بۆیان نییە هەستی نەتەوەیی خۆیان دەربڕن. کوردەکان لەژێر پاڵەپەستۆو زۆرلێکردندا دەناڵێنن. ناوەڕۆکی بزووتنەوەی کوردی بەتەواوی دیموکراتییە، چونکە بەرگری لە خۆی دەکات دژی ئیمپریالیزم و زۆرلێکردنی تورکی و عەرەبی و فارسی. دیموکراتی و شۆڕشگێڕی بەم بەرەنگاربوونەوەیە بەستراونەتەوە. لەبەر ئەم هۆیە بەرگری کردن لە هەستی نەتەوەیی و خاسیەت و نرخە نەتەوەییەکان بە یەکێ لە مەرجە بناخەییەکانی دیموکراتی و شۆڕشگێڕی دادەنرێت بۆ کوردەکان. نەتەوەی کورد لە جەوهەرو ڕێبازیدا دەستدرێژکاری تێدا نابینرێت. بەڵکو نەتەوە پەرستەکانی تورک و عەرەب و فارس دەستدرێژکارن. سروشتی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی ناواخنەکەی ئیمپریالیزمانەیە. بەتەواوی و بە پێچەوانەوە نەتەوەی کورد هەوڵ دەدات بۆ رزگاربوون لە ئیمپریالیزم و ئامانجی یەکسانی بوونە لەگەڵ تورکەکان و عەرەبەکان و فارسەکان وە هەوڵ دەدات بۆ

رزگارکردنی کوردەکان لە هێرشە درندەکان.
لێرەدا رایەکی هەڵە هەیە لای شۆڕشگێرە کوردەکان. کاتێ مرۆڤ باسی نەتەوەی کوردو هەستی نەتەوەیی دەکات، ئەوان وا تێدەگەن کە دەرەبەگ‌و هۆزەکان‌و شێخ‌و ئاغاو موڵکدارەکان دەگرێتەوە. وا تێدەگەن کە نەتەوەو خاسیەتەکانی نەتەوەیی تایبەتە بەوان. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. نەتەوەی میللەتێکی ژێردەستەی زۆرلێکردن نابێتە بەرهەڵستی بەرژەوەندیەکانی چینە زەحمەتکێشەکان. ئەم نەتەوەیەلەگەڵ بەرژەوەندیەکانی چینە زەحمەتکێشەکان یەکدەگرێتەوە. چونکە تا ئێستا دەرەبەگ نەگۆڕاوە بۆ چینێکی بۆرژوازی لە کوردستان. پێش ئەوەی کە دەرەبەگ بگۆڕێ بۆ چینێکی بۆرژوازی دەوڵەت کردی بە نۆکەر. لەبەر ئەوە دەرەبەگ وەک چینێک پلەو پایەیەکی وەهای نییە تا بەنەتەوە بنازێ. تێکەیشتنی هەڵەی نەتەوەو هەستی نەتەوەیی لای شۆڕشگێرە کوردەکان لەژێر کارتێکردنی چەپی تورکی لەدایک بووە. چەپی تورکی هەمیشە بزووتنەوە کوردییەکانی بە بزووتنەوەی نەتەوەیی ناو دەبردو بە نەتەوەشیان تاوانبار دەکرد. ئەم رەخنەگرتنەش لە بناخەوە بە گوێرەی ئایدیۆلۆژی رەسمی هاتۆتەکایەوە. بۆ نموونە شۆڕشی شێخ سەعید(١٩٢٥)وەک بزووتنەوەیەی نەتەوەیی رەخنەی لێ نەگیرا بەڵکو وەک بزووتنەوەیەکی ئاینی. ئامانجی ئەم رەخنە گرتنەش نەهێشتن‌و لاوازکردنی هەستی نەتەوەیی کوردی بوو. چونکە کەمالیزم دژی هەموو شێوەکانی بزووتنەوە کوردییەکانە. چەپی تورکی لە شەستەکان‌و حەفتاکاندا بزووتنەوە کوردییەکانی بە نەتەوەیی لەقەڵەم دەداو بە شۆڕشگێری نێونەتەوەیی نەدەژمارد. لە بنچینەدا ئەوانەی کە دروشمی نەتەوەیی بەرزدەکەنەوە چەپە تورکەکان خۆیانن. با ساڵەکانی شەستەکان‌و حەفتاکان بێنینەوە یادو ئەو دروشمانەی کە زۆر شۆڕشگێری‌و باو بوو لە خۆپیشاندانەکان بریتی بوو لە دروشمی

(تورکیای سەربەخۆ). ئەوان بیریان چۆتەوە کە چۆن (تورکیای سەربەخۆ) دامەزرا. ئیمپریالیزمی بەریتانیو فەرەنسیو کەمالیزمو میرنشینو شێخ نشینە عەرەبو فارسەکان لەگەڵ یەکدا کوردستانیان دابەشو پارچە پارچە کردو تا لەم کاتەدا بەشێکی گەورەی کوردستان کەوتە نێو سنووری دەوڵەتی تورکیای تازە. کەواتە تورکیا چۆن دەتوانێت سەربەخۆ بێت لەسەر بناخەی سیاسەتی ناکۆکی نانەوەی ئیمپریالیزم. چەپە تورکەکان هەرکات بانگاشەی ئەم دروشمەیان کردووە. لەکاتێکدا هەموو داوا کوردییەکانیان بە نەتەوەیی تاوانبار کردووە. بەڕاستی ئەمە مەسخەرەیە. ئەم کارە لە شەستەکانو حەفتاکان نەدوزرایەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێش نەکەوتنی هەستی کۆمەلایەتیو مێژوویی کوردەکان لەوکاتەدا. (وەلامی ئەوانیان نەداوە بەوەی کە هاوکاریان کرد لەگەڵ ئیمپریالیزم بە مەبەستی دابەشکردنو پارچە پارچە کردنی کوردستان.) کەمالیزم هەتا ڕادەیەکی زۆر کاری کردە سەر چەپی تورکی.

لەلایەکی ترەوە چەپی تورکی هەر لەو سالانەدا بەرگری لە مافەکانی گەلی ڤیتنامیو فەلەستینیو نیکاراگواییو ئەنگۆلی دەکرد لە مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ خۆیان. بەلام هەلوێستیان بەرامبەر بە کوردەکان بەشێوەیەکی تر بوو، نە تەنیا بەرگرییان لە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەدەکرد، بەلکو هەتا قسەکردن بە زمانی کوردیشیان بە هەلەیەکی گەورە دەزانی. هەتا شۆڕشگێرە کوردەکانیش بۆ ئەوەی نەبنە ئامانجی بیانووەکانی چەپی تورکی وەک ئەوان پارێزگاریان لە زمانی کوردیو ئەدەبی کوردیو کاروبارەکانی گرێدراو بەم مەسەلەیە نەدەکرد. لەهەمان کاتدا خۆیان بە مارکسیو لینینیو نێونەتەوەیی دەژمارد.

لە ڕۆژی ئەمڕۆدا هەتا مافی خوێندنی قورئانو لەدایکبوونی

پێغەمبەر (مەولود) بووەتە کارێکی شۆڕشگێڕی. دەوڵەتی کۆلۆنیالیستو شۆڤێنی بەرهەڵستیو هێرشی هەر شتێکی کوردی دەکات. دەیەوێت هەر شتێک کە پەیوەندی هەیە بە کوردەکان لە ڕەگو ڕیشەوە دەربکێشێت. هەموو شێوازێک دەگرێتەبەر وە یاسا دێنێتە ئاراوە لە پێناوی لەبەین بردنی زمانو کەلەپوری میللیو مۆسیقای کوردی. نەدانی بایەخی پێویست بەم مەسەلانەی سەرەوە کە باسکرانو جەخت نەکردن لەسەریانو هێنانەوەی بەهانەی (ئێمە شۆڕشگێڕو نێونەتەوەیین) تەنیا دەبێتە خزمەتکردنی ئیمپریالیزمی تورکیو بەس. بایەخدان بە کوردیو هەموو شتێکی گرێدراو بە زمانی کوردی بەرهەڵستیو ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەگەزپەرستیو ئیمپریالیزمی تورکی دەگەیەنێت.

تێگەیشتنی کوردەکان بۆ نەتەوە پێویستە جیاوازی هەبێت لەگەڵ تێگەیشتنی تورکەکانو عەرەبەکانو فارسەکان بۆ هەمان مەسەلە. نەتەوەی عەرەبیو فارسیو تورکی دەست درێژکەرو ناحەزانەو تۆوی ئیمپریالیزمیان پێوە دیارە. نەتەوەی کوردی پارێزگاری میللەتی کورد دەکات لە پێناوی بەدەستهێنانی هەر هەمان ئەو مافانەی کە تورکەکانو عەرەبەکانو فارسەکان هەیانەو پاراستنی گەلی کورد لە بەرامبەر هێرشەکانی نەتەوەی دوژمنو ئیمپریالیزمو ڕەگەزپەرستی. نەتەوەی کوردی ناوەڕۆکێکی دیموکراتیانەی هەیە چونکە بەرەنگاری ئیمپریالیزمو داگیرکەری ڕەگەزپەرست دەبێتەوە.

کاتێ کە لە گۆڕانکارییە نوێکانی ئەوروپاو بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا بڕوانین دەبینین کە نەتەوەو بزووتنەوە نەتەوەییەکان نا هاوچەرخن. ئەوروپا بەرەو یەکێتی هەنگاو دەنێتو ئەمەش کارێکی سروشتییە، ئەم کردارە شێوەیەکی تری هەیە لە کوردستان. لەکوردستان زۆر لێکردنو سەرکوتکردنەوەیەکی گەورە لە ئارادایە. پێویستە لەسەر

کوردەکان چەمکی نەتەوە سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنن. نابێ پێوانەی چەپی تورکی بۆ نەتەوە وەک پێوەر پەسند بکرێت. پێویستە تێگەیشتن‌و دەرک پێکردنی کوردەکان سەربەخۆو تایبەت بە خۆیان بێت. ئەوەی کە کوردەکان پێویستیان پێیەتی بیرو هەڵوێستی مارکسیزم لینینزم نییە بەڵکو هەستی نەتەوەییە. نموونەیەک لەسەر لاوازی هەستی نەتەوەیی دەخەمە بەرچاو. یەکێ لە هاوڕێیان بۆی گێڕامەوە: زانایەکی ئەرکیۆلۆژی چووە ئەفریقا. وێنەو نەخشەی کێشراوو هەڵکەنراوی سەر دارەکان سەرنجی ئەوی ڕاکێشا. کاتێ ئەم زانایە ویستی دەست بگرێ بەسەریاندا تووشی بەرهەڵستییەکی سەختی دانیشتوانی ناوخۆی ئەم شوێنە بوو: (دەست لە هیچ بەردێک‌و خۆڵ‌و لقی دارێک نەدە. ئەوانە موڵکی ئێمەن‌و میراتی باب‌و باپیرانمانە.) باشان بە دارو بەردو تیرو کەوان هێرشیان کردە سەر زانای ناوبراو. دوای ماوەیەک هەر هەمان زانای فەرەنسی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا لە ناوچەکانی دەوروبەری ڕووباری دیجلەو فورات، لەوێ دانیشتووە کوردەکان یارمەتی زۆریان دا. هەتا بەردی بە نرخ‌و فەخفوری وێنە لەسەر کێشراویان لەبەردەم دانا: (ئەم شتانەش لەگەڵ خۆت ببە.) وە بەبێ پارە. کاتێ زانای فەرەنسی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامداو دوای ئەوە بیری ئەوە دەکاتەوە لە ئەفریقا چی بەسەر هاتووە دەڵێت: (هەستی نەتەوەیی‌و خۆبەستنەوە بە نیشتمان لای کوردەکان لاوازە. هەموو شتێک کە شکیان پێ دەبرد دایان بە من. نەترسان‌و نەشیانزانی کە ئەم شتانە لە نیشتمانیان بزر دەبێت. نەیانزانی ئەم شتانە بەڵگەنامەن لەسەر مێژوو و ڕابردوویان.) کاتێ باس دێتە سەر هەستی نەتەوەیی پێویستە ئەرمەنەکان‌و جوولەکان یاد بکەینەوە. ئەم نەتەوانە گەلێ جار زۆرلێکردنیان دیوە لە مێژوودا. دەرهەقی ئەوان قەسابخانە بەرپاکراوەو لە نیشتمانی خۆیان وەدەرنراون، بەلام ئەوان قەت قەت ئەم

قسابخانانەیان لەبیر نەچۆتەوە. بەهێزیی هەستی نەتەوەیی ماوەی ئەوەیانی نەداوە کە (نەتەوەیی)یان بزربێت. لەکاتێکدا دەبینین کوردەکان زۆر بە ئاسانی ئەو زۆرلێکردنو قسابخانانەی کە دژیان ئەنجام دراوە لەبیر دەکەن. لاوازی هەستی نەتەوەیی لەم نموونەیەدا زۆر ئاشکرایە.

ز- پێویستە بیر لە مەسەلەیەکی تریش بکەینەوە. تا ئێستا شۆڕشگێرە تورکەکان گفتوگۆ لەسەر مەسەلەیەک دەکەن ئایا کوردستان کۆلۆنی (موستەعمەرە)یە یان نا؟ گفتوگۆی ئەوە دەکەن ئایا پێویستە لەسەر کوردەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ خۆیان ڕێکبخەن یان نا؟ ئەم گفتوگۆیانە تا ڕۆژی ئەمڕۆش بەردەوامە... بەڕاستی جێگای داخە کە مقۆمقۆی ئاوەها لەگۆڕێدایە... بەلام بە بڕوای من پێویستە بەشێوەیەکی چاک لەم مەسەلانە بکۆڵینەوە.

ئایا کوردستان موستەعمەرەیە یان نا؟ نە بەتەنێ موستەعمەرەیەو بەس بەڵکو لەوەش زیاترەو تا دەگاتە پلەی دەستدرێژی کردنی سەر ئابڕوو نامووس. ووشەی شەرەف ووشەیەکی زانستی نییە بەڵکو ڕەوشتییە. باسکردنی ئازاری کۆمەڵگای کوردەواری بە شێوەو چەمکی زانستی لە تواناادا نییە. ووشە زانستییەکان بەشی باسکردن ناکەن. لەم ساڵانەی دواییدا زۆر ووشە هاتۆتە ئاراوە کە باسی ڕاستی یا وەسفی دەکەن. بۆ نموونە ووشەی (کەوتن) ووشەیەکی لەم جۆرەیە کە زۆر جار سکرتێری گشتی PKK عەبدوڵلا ئۆجالان لە ڕۆژنامەی (سەرخۆ بوون) بەکاری دەهێنێت. هەڵبەتە کوردستان کۆلۆنی تورکییە.

دەڵێن: (تورکیا بە خۆی نیو کۆلۆنی ئیمپریالیزمە. دەوڵەتێکی نیوە داگیرکراو چۆن دەتوانێ ببێتە خاوەنی کۆلۆنیو داگیرگە.) دیارە تورکیا تەنیا ئەوەی کەمە کە ببێتە داگیرکەر. سوپاو هێزی پۆلیسو بنکەی پۆلیسو دادگاو سازمانی ئاسایش زۆر دەزگای سەرکوتکەری تر

له توركيا هەن. ميكانيزمی بەڕێوەبردن‌و مووچەخۆران‌و كارمەندان هەن. رۆژنامەو گۆڤارو ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و گشت هۆیەكانی ڕاگەیاندن هەن. ئایا سەركردایەتی دەوڵەتی بۆرژوازی ئەزموون‌و زانیاری لەبەردەستدا نییە لە بوارەكانی بازرگانی‌و پیشەسازی بە مەبەستی گۆڕینی كوردستان بۆ موستەعمەرە؟ ئایا سەرمایەی گردەوەبووی پێویستە؟.

ژمارەی لەشكری توركی لە هەشت سەد هەزار سەرباز تێپەڕدەكات‌و شوێنی دووەم دەگرێتەوە لە ناتۆ دوای سوپای ئەمریكی. پۆلیس‌و جەندرمەو هێزی تایبەتی‌و سازمانی ئاسایش‌و بەكرێگیراوو سیخوڕەكانیان زۆرو زەبەندن. بنكەكانی هێزی تایبەتی‌و زۆری‌تر. دەوڵەت خاوەنی نزیكەی هەزار زیندان‌و گرتووخانەیە. خاوەنی هێزی ئاسایشە. كاتێ كە ئەم بنكەو بارەگایانە دروست دەكەن داوای مۆڵەت لە ئەمریكا ناكەن. دەوڵەتی توركیا ئەم دامودەزگایانە دروست دەكات‌و سەركردایەتیان دەكات. نابێت بەراوردی دەوڵەتی توركی لەگەڵ دەوڵەتانی ئەفریقاو دەوڵەتانی ئەمریكای ناوەڕاست‌و ئەمریكای باشوور بكەین كە تەمەنیان ناگاتە زیاتر لە بیست سیساڵێك یا پەنجا شەست ساڵێك یا هەتا سەد ساڵێك. دەوڵەتی توركی بەردەوامی ئیمپراتۆری عوسمانییە. تەمەنی بە تەنێ لە ئەنازۆڵ‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگاتە زیاتر لە هەزار ساڵ. دەزانین میكافیلی چی لە كتێبەكەی خۆی (میر) نووسیوە. لەپێش ئەویش وەزیری سەلجوقییەكان (نیزامولمولیك) لە سەدەی یازدەهەم شتێكی وەك ئەوی (میكافیلی) نووسیوە لە كتێبەكەی خۆی (سیاسەتنامە).

بۆ ئەوەی كە توركیا ببێتە دەوڵەتێكی ئیمپریالیزمی پێویستی بە مۆڵەت وەرگرتن‌و زانیاری لە ئەمریكایی‌و ئینگلیزەكان نییە... زیندانەكانی توركیا پڕن لە زیندانییە سیاسییەكان. لەبەر ئەوە ئەو پێویستی بە زانیاری ئەمریكایی‌و ئینگلیزی نییە. لەم بارەیەوە توركیا

خاوەنی ئەزموون و شارەزاییەکی دوورو درێژە.

مەنتیقی (داگیرکردنی کۆلۆنی و داگیرکردنی نیوە کۆلۆنی) بۆش و بێ مانایە. بەکورتی باسی ئەوەمان کرد کە تورکیا نیوە موستەعمەرەشی هەیە. سوپاو هێزی پۆلیس و دادگاو هۆیەکانی راگەیاندن و زانکۆکان و دەزگاکانی پەروەردەو بەڕێوەبەرایەتی ئەمن و ئاسایش و زۆری‌تر. ئایا کوردەکان لە بەرامبەر ئەمانە چ شک دەبەن؟ تورکیا هەرچەندە نیوە کۆلۆنییەو خاوەن ئەم هەموانەیە، ئاخۆ دەبێ چ دەربارەی کوردەکان بگوترێ کە هیچ شتێک شک نابەن. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە تورکیا هەتا خاوەن گشت کارگەکان و پیشەسازگەکانە کە لە کوردستاندا هەن.

بێگومان کوردستان کۆلۆنی تورکییە. زۆرلێکردن و بڕینەوەی زۆرو شێوە هەرە دڕندەکانی ئیمپریالیزمی و قەسابخانە گشتییەکان کە لە کوردستان ئەنجام دران لەسەردەمی مستەفا کەمال بوو، وەلەو ماوەیەدا کە تورکیا لەژێر دەستی ئیمپریالیزم رزگاری بوو بوو.

بابەتێکی‌تر هەیە کە پەیوەندیدارە بە بابەتی ئایا کوردستان کۆلۆنییە، ئەویش بابەتی رێکخستنی کوردەکان و بەڕێوەبەرایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی و شۆڕشگێڕی و ئەو مەسەلانەی کە تایبەتن بەم بابەتەوە. بابەتی (کوردستان کۆلۆنییە) چەپە کوردەکان لە چەپە تورکەکان جیادەکاتەوە. زۆربەی زۆری چەپە کوردەکان بیرۆکەی کوردستان کۆلۆنییە پەسند دەکەن. بەلاّم بە پێچەوانەوە بەشێکی گەورەی فراوان بوونی جەنگی پارتیزانی و پێشکەوتنی بیروباوەڕی پارتیزانەکانیش بەخۆیان ئەم مەسەلەیە زیاتر میللی بوو و بەرز بووەوە لەنێو جەماوەردا. بەم شێوەیە ژمارەی ئەو کەسانەی کە بوونی ئیمپریالیزم دەسەلمێنن رۆژ بە رۆژ لە زیاد بووندایە. وا بڕوا دەکەم کە بیرۆکەی (موستەعمەرە) چەمکێکی باشە بۆ روونکردنەوەی بنیاتنانی

کۆمەڵو پێشکەوتنی مێژوو. چونکە چەپی تورکی خۆی بێ بەش کردبوو لە وەرگرتنی ئەم چەمکەو تێگەیشتنی ڕاستی بۆ پێشکەوتن. بیرۆکەی کوردستان کۆلۆنییە بەستراوە بە مەسەلەی چۆنیەتی ڕێکخستن. ئەوەی کە بیرۆکەی ئیمپریالیزم پەسند بکات ئەوا بیرۆکەی سەربەخۆیەتی ڕێکخستنیش پەسند دەکات. ئەم شتەش کتومت ئێستا ڕوو دەدات. چەپی تورکی بە لاساری‌و گەرمییەوە هەوڵی ئەوەی داوە کە ڕێکخراوەکانی خۆی بسەپێنێت بەسەر کوردەکان‌داو شێوەی ئەم پەیوەندییەش بەتەنێ لە کوردستان هەیە. ئەم پەیوەندییە لە نێوان چەپی گەلی سەردەست‌و چەپی گەلی بندەست‌دا خۆی دەنوێنێت. مرۆڤ لە شوێنێکی‌تردا ئەم جۆرە پەیوەندییانەی بەرچاو ناکەوێت.

با لە پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی ئازادیخوازی فەلەستین‌و ئیسرائیل ووردببینەوە. هیچ شۆڕشگێڕێکی ئیسرائیلی‌و کۆمۆنیستی جوولەکە پێشنیاری ڕێکخستنی هاوبەش لەگەڵ فەلەستینییەکان ناکات. فەلەستینییەکانیش داوای ڕێکخستن ناکەن لە نێو چوارچێوەی پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل، چونکە ڕێکخراوی فەلەستینی سەربەخۆ لەو زەوییانەی کە ئیسرائیل داگیری کردوون لە ئارادایەو لە لایەکی‌ترەوە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل پارتێکە دەتوانرێ پشتی پێ ببەستریێو بڕوای پێ بکرێ‌و چاکترە لەو پارتانەی کە لەو دەچن‌و لە تورکیا هەن. پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل پەیوەندی لەگەڵ بزووتنەوە فەلەستینییەکان دروست دەکات‌و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات هەرچەندە کێشەی ئیسرائیل - فەلەستین لەگۆڕێ‌دایە. ئەم پەیوەندییانەش بە ئاشکراو بە ئامادەبوونی هەموو هۆیەکانی ڕاگەیاندن ئەنجام دەدرێت، فەلەستینییەکان مافی ڕێکخراوەی سەربەخۆیان هەیە. ڕێکخراوەی سەربەخۆ بۆ کوردەکانی کوردستانی باشوورو ڕۆژهەلات گیروگرفت بۆ چەپی تورکی دروست ناکەن، لەگەڵ ئەوەشدا پرسیان

پێدەکەن و پاڵپەستۆی ئەوەیان لەسەر دەکەن کە ڕێکخراوی هاوبەش پێکبێنن و دەڵێن (نێونەتەوەیی و شۆڕشگێری پێویستیان بەم کارە هەیە.) چەپی تورکی لە ساڵەکانی ١٩٦٩-١٩٧٠ ئەرکی نێونەتەوەیی خۆیان بەرامبەر بە فەلەستینییەکان ئەنجامداو بەشداریان کرد لە خەبات دژی ئیسرائیل و بۆیان هەبوو بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان لەوێ بمێننەوە. هەندێک لەوان مەشقیشیان کردو بەشداری جەنگیشیان بە چاکی کرد لەوکاتەدا کەسێک لەوان باسی سەپاندنی پرۆگرام یا مەرج بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ فەلەستینییەکان بە ووشەیەک چییە نەکرد. تێڕوانینی چەپی تورکی بەرامبەر بە کوردستان و بەرەنگاربوونەوەی دیموکراتی و شۆڕشگێری بە هەمان شێوەو ڕێگای ئەوان بۆ فەلەستینییەکان نەبوو و جیاوازی هەبوو. لەلایەنی ڕێکخراوەییەوە چەپی تورکی هیچ سوودێکیان نەبووە بۆ کوردەستان. تەنیا ڕێگە پێدانی ئەندامە کوردەکان بۆ ئەوەی لە ڕێکخراوەکانی خۆیان جیابنەوەو بە تەواوی لەگەڵ ئەوان کاربکەن. ئەمەیان بە باشترین خزمەت دەزانی.

کاتێ لە ئیمپریالیزم و ڕێکخراوەی هاوبەش دەدوێن نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە کوردستان لە موستەعمەرەشی تێپەڕاندووە. کوردستان وولاتێکی دابەشکراوو لەت لەتکراوە لەنێوان چەند دەوڵەتێکدا. کورستان موستەعمەرەی نێودەوڵەتانە. داوای (یەکگرتنی شۆڕشگێرە کوردەکان لە تورکیا لەگەڵ شۆڕشگێرانی تورک، وە شۆڕشگێرە کوردەکان لە ئێران لەگەڵ شۆڕشگێرانی ئێرانی، وە شۆڕشگێرە کوردەکان لە عێراق لەگەڵ شۆڕشگێرانی عێراقی) داوایەکی شۆڕشگێرانە نییە ئەم پێشنیارانە خزمەتی ئیمپریالیزم و داگیرکەران دەکەن.

بنەڕەت و ناوەرۆکی مەسەلەی کوردی بەم جۆرەیە: مەسەلەی کوردی مەسەلەی کەمە نەتەوەییەک نییە. مەسەلەی خاک و میللەتێکی

دابەشکراوو پارچە پارچە کراوە کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزیو فەرەنسیو بەکرێگیراوە ناوخۆییەکان وەکو کەمالیستەکانو مۆنارکییە عەرەبو فارسەکان ئەم کارەیان دژی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ ئەنجام داوە. ئا ـ ئەمەیە جەوهەری مەسەلەی کورد. نەخشەی ئەم پیلانە لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیو ساڵانی ۱۹۱۹-۱۹۲۲ لەکاتی شەڕی تورکی - یۆنانیو شەڕی تورکی - ئەرمەنی کێشراوە. لەوکاتانەدا زۆر ڕووداوو کارو فرمانی نوێ هاتنە کایەوە کە هەریەکەیان کاریگەری خۆیان هەبووە. بۆ نموونە: تورکەکان، ئەرمەنەکان، عەرەبەکان، ڕوسیای تەزاری، شۆڕشی بەلشەفی، ئیمپریالیزمی ئینگلیزیو ئیمپریالیزمی ئەلمانی، خەلافەتی ئیسلامیو خەلافەتی سوڵتان، ئەنوەر پاشا، مستەفا کەمال، کۆمەڵەی (اتحاد و ترقی)، هێزە نەتەوەییەکان. لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەم ڕووداوو چەمکانەو پەیوەندییان بە مەسەلەی کوردەوە کارێکی پێویستە.

سەرخۆبوون: پەیامی ئێوە بۆ تورکیاو جیهانو مرۆڤایەتی پێشکەوتنخواز چییە؟

بێشکچی: هەوڵی ئەوەمدا لە وەڵامی پرسیاری یەکەم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە دابەشکردنی کوردستان لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم بووە هۆی لێدانێکی مەزن لە نەتەوەی کورد، چۆن ئەم سیاسەتە نەخشەی بۆ کێشراوەو ئەنجام دراوەو ئایا بۆ کوردستانو دژی کوردەکان ئەم کارە کراوە؟ وە ئەمەش ئاشکرایە. هەروەها ئێمە خاڵی لاوازی کۆمەڵگای کوردەواریش دەزانین. ئەم سیاسەتە سیاسەتێکی ناڕەوایە. بێ شک سیاسەتی ئیمپریالیزمو داگیرکەر ڕەوا نابێت. وابڕوا دەکەم کە ناڕەوایی ئەم سیاسەتەش لە کوردستان لە ڕاددەی خۆی تێپەڕاندووە. دەمەوێ ئەوە بێژم کە سیاسەتی ناکۆکی نانەوەی ئیمپریالیزمو جێبەجێ کردنی لە کوردستان زەرەرو زیانێکی گەورەی بە کۆمەڵگای کوردەواری

گەیاندووە. ڕای دیموکراتی گشتی جیهانیو ڕای گشتی تورکی ئەم ڕامیارییە بە شێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا دەبیننو وا خەریکە ئێستا نارەزامەندی خۆیان دژی ئیمپریالیزمی جیهانی لە کوردستان دەردەبڕن.

ڕای گشتی دیموکراتیو شۆڕشگێڕی لە جیهانو تورکیا ڕێگاو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کوردستانیان بە چاکی بۆ دەرکەوتووە. کۆمەڵگای کوردەواری دووچاری زۆر مەترسی لەناوبەر هاتووە. تورکەکانو عەرەبەکانو فارسەکان بەشێوەیەکی ڕاست بەڕێوەبەرایەتی کوردەکان ئەنجام نادەن. سیاسەتی دەوڵەت لە کوردستان نەگەتیڤو خراپە. کوردستان بە هێزی چەکی کیمیاوی بەڕێوەدەبەن. لەپێناوی بەڕێوەبردنی کوردستان تەڕو ووشک پێکەوە دەسووتێنن‌و ترسو تیرۆر بڵاودەکەنەوە. بەبێ پرسیار کردن بێتاوانان دەکوژنو پاشان لاشەکانیان دەسوتێنن تا ڕووی ڕەشیان بەدیار نەکەوێت. لەم بارودۆخە ناهەموارەدا پێویستە باسی مافی بڕیاردانی چارەنووسی کوردەکان بکرێت. بۆچی دەبێ تورکەکانو عەرەبەکانو فارسەکان بەڕێوەبەرایەتی کوردستان بکەن؟ ئەگەر کوردەکان بەخۆیان بەڕێوەبەرایەتی خۆیان بکەن ئەوە شتێکی سروشتییەو شایانی ئەوەن. خراپترین شێوەی بەڕێوەبەرایەتی خۆیی کوردی چاکترە لە چاکترین بەڕێوەبەرایەتی ئیمپریالیزمو ڕەگەزپەرستەکانو هێزە فاشستییەکان.

مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان هیچ بوونێکیان نییە. کوردستان بە بڕیارەکانو فرمانەکانو دوورخستنەوەو خستنە ژێر چاودێریو قەدەغە کردنو حوکمدان بەڕێوەدەبرێت. بەڕێوەبەرایەتی ئیمپریالیزمی تورکی لە کوردستان نوێنەرایەتی گەلی کورد ناکات. دەوڵەتی تورکی دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمییەو باری کورد زۆر زەحمەتو دوورتریشە لە باری داگیرگەیەک. هەڵسوکەوت لەگەڵ گەلی کورددا وەک هەڵسوکەوتی موستەعمەرەش نییە. دەوڵەتی تورکی لە کوردستان زۆر لێکردنی خۆی

بە یارمەتی هێزە ئیمپریالیزمییەکان بەڕێوە دەبات. وولاتە ئیمپریالیزمییەکان تورکیا بە چەکی نوێ پڕ چەک دەکەنو ئەویش دژی میللەتی بێ بەرگریو زۆرلێکراو بەکاری دەهێنێت. بەلام جیهان تەنیا لە دەولەتان پێک نایەت. لێرەدا ڕای گشتی جیهانی هەیە کە بەشێوەیەکی چاکتر داواکانو ئامانجە ڕەواو دیموکراتییەکانی گەلی کورد دەرک پێدەکاتو پشتگیری خەباتی شۆڕشگێڕانەی ئەم گەلە دەکات لەپێناوی ئازادیو سەربەخۆیی. پشتگیری کردن بە زۆر شێوەی جیاواز دەبێت. ئەم پشتگیری کردنە خەباتی دیموکراتیو شۆڕشگێڕیو بەرەنگاربوونەوەی نەتەوەیی کوردەکان پێش دەخات.

لە ڕۆژی ئیمڕۆماندا مەسەلەی مافەکانی مرۆڤو گەلە زۆرلێکراوەکانو داگیرکراوەکان بووەتە مەسەلەیەکی مرۆڤایەتی. دەرخواردنی خەلک بە جۆرە ماددەیەکی تایبەتیش بە مەبەستی سەرشۆڕکردن بە مەسەلەیەکی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت. هەروەها بەکارهێنانی چەکی کیمیاویو زۆر کارو کردەوەی وەک ئەویش بە گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی هاوچەرخ لەقەلەم دەدرێت. کەسێک بۆی نییە بلێت ئەم تەنگو چەلەمەیە کاری ناوخۆیی دەولەتێکەو بەس.

کوردەکان ئیمڕۆ لە کوردستان بە جۆشو خرۆشەوە دژی ڕژێمە ئیمپریالیزمییەکان شەڕ دەکەنو دەیانەوێ جێگای خۆیان وەک گشت گەلانیتر لەنێو جیهانی هاوچەرخدا بکەنەوە. ئەمە خەباتێکی نوێو هاوچەرخە دژی زولمو زۆرلێکردنی نا هاوچەرخ. لەبەر ئەوە پێویستە ڕای گشتی دیموکراتیو شۆڕشگێڕی لە جیهانو تورکیا یارمەتی ئەم بەرەنگاربوونەوە ڕاستەقینەیە بدەنو تاکو کوردەکانیش بگەنە ئاستی سەردەم.

تورکیا تاکە دەولەتێکە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو ناوچەی بولقان کە بوونی میللەتێک ناسەلمێنێتو دان بە مافە نەتەوەییو

دیموکراتییەکانیدا نانێت. بولگاریاش لە تورکیا فێری ئەوە بووە کە کەسێتیو ناسنامەی تورکەکانی ئەوێ پەسند نەکات. تورکیا لەم بوارەدا مامۆستاو سەرکردەیە. یۆنانیش هەر لە تورکیا دەرسی وەرگرت کاتێ کە مافی تورکەکانی ڕۆژئاوای تەراقیای پێشێل کرد. تورکیا رابەری ڕەگەزپەرستییە. ئایا لە جیهان نموونەیەکی وەک ڕەگەزپەرستی تورکی هەیە؟ زۆر کۆنەپەرستترو دڕندەترو رووخێنەرترە لە ڕەگەزپەرستی ئەفریقای خواروو. زۆر بە ئاسانی گەلێ گۆڕانکاری لە بولگاریاو ڕۆژئاوای تەراقیاو خوارووی ئەفریقا ڕوودەدات بەلاّم گۆڕانکاری لە تورکیا زەحمەتترە. ئەم ڕەگەزپەرستییە تایبەتییە بە ورکەکان... نکۆلی کردن لە نەتەوەی کوردو زمانی کوردیو بچووک کردنەوەو پێشێل کردنی فەرهەنگو زمانی کوردیو سەپاندنی ەرهەنگو زمانی تورکی گەیشتۆتە رادەیەکی ئەوتۆ کە پیاو ئەگەر ورک نەبێت ناتوانێت گوزەران بکات. پێویستە پاڵپشتیو پشتگیری ووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بکرێت لە پێناوی نەهێشتنی ئەم نموونە راپەو زۆرلێکردنە لەسەر ڕووی جیهان.

سەرخۆبوون: کەسانێک لەنێو ڕیزەکانی ڕێکخراوەکانو بزووتنەوەی یوکراتیو شۆڕشگێڕییە تورکەکان لە کوردستان دەبینرێن، ڕای ئێوە ربارەی ئەمە چییە؟

بێشکچی: لە شەستەکانو حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا بەشێوەیەکی اوان گەلێک لە شۆڕشگێڕان کە لە ڕەسەندا کورد بوون جێگای یان کردبۆوە لە ڕیزەکانی ڕێکخراوە تورکییەکانو چالاکی رامیارییان جام دەدا. ئێمڕۆ ئەمە کەم بۆتەوە. ڕەخنەم هەیە لەسەر ئەم بابەتە. فنەی من تایبەتە بە مەسەلەی (نێونەتەیی) چونکە ئەو کەسانە یان بە (نێونەتەوەیی) لەقەڵەم دەدەن. کاتێ کە قسە بۆ ئەو کەسانە ەرێو پێیان دەوترێ (پاڵەپەستۆیەکی گەورە لەسەر زمانی کوردی

هەیەو پێویستە خەباتێکی زۆر بۆ نەهێشتنی ئەم پاڵەپەستۆیە بکرێت. بەڕای ئێوە چ بکەین باشە؟ ئایا بیروباوەڕو پێشنیارێکتان لەسەر ئەم بابەتە هەیە؟) وەڵامیان بەم جۆرە دەبێت (ئێمە شۆڕشگێڕین. ئێمە نێونەتەوەیین. مەسەلەی سەرەکی بۆ ئێمە شۆڕشگێڕیو مارکسیزم-لینینزمە. کە مرۆڤ کورد، عەرەب یا تورک بێت هیچ بایەخێکی نییە. لە هەمووی گرنگتر ئێمە نێونەتەوەیین.) ئەم ووتانە بە وەڵامی بابەتەکە ناژمێردرێن. لەلایەکی ترەوە ئەو کەسانەی کە خۆیان بە نێو نەتەوەیی دەزانن هەمیشە بە تورکی دەدوێنو گوێ لە مۆسیقای تورکی دەگرنو مۆسیقای تورکی لێدەخەنو شیعرو ئەدەبی تورکی دەخوێننەوە. بە مانایەکی‌تر لە نێو فەرهەنگی تورکیدا دەژین. بەهیچ جۆرێک بە کوردی ناپەیڤنو زۆربەی زۆریان کوردی نازانن. وە مێژووی کوردیش نازانن... بەتەواوی تواونەتەوە.

ئەگەر باسو خواس لەسەر زۆرلێکردنو قەسابخانەکان بێتەگۆڕێ ئەوانە باسی مێژووی گەلانی‌تر دەکەن. کاتێ کە باس دێتە سەر زۆرلێکردنو قەسابخانە بە کۆمەڵەکان کە لە کوردستاندا ڕوویانداوە ئەوانە نە لە دوورو نە لە نزیکەوە باسی ئەمانە ناکەن. هەرچەندە کە مێژووی کوردستان پڕە لە نموونە. قەسابخانەکانی زیلان ۱۹۳۰. مەوتۆو لاچی ۱۹۳۷-۱۹۳۸. تیلرەدەرو سەفۆ ۱۹٤۳. قەسابخانەی بە کۆمەڵ لەم شوێنانەدا ڕوویداوە. کوردە (نێونەتەوەییە)کانمان ئەم هەموانە نازانن یا لەبیریان چۆتەوە. هەتا ناشزانن بۆچی باوو باپیرانیان کوژراونو سەربڕاونو هیچ پەرۆشییەکو پاڵ پێوەنەرێکیان نییە بۆ زانینی ئەم کارەساتانە.

من بەم شێوەیە بیردەکەمەوە: ئەو کەسانە کوردێتی خۆیان ئاشکرا ناکەن چونکە دەزانن نرخی مرۆڤ چەندە گەر کورد بێت. لەبەر ئەوە خۆیان بە (نێونەتەوەیی) لەقەلەم دەدەن. هەروەها پۆلیسو داواکاری

گشتی لە دادگادا لە (نیونەتەوەییەکان) دەپرسێت. بەم شێوەیە ئەو کەسانە لە لایەک خۆیان بەزێدە شۆڕشگێڕ حیساب دەکەن‌و لە لایەکی‌تریشەوە باجی کەمتر دەدەن. هەموومان دەزانین ئەگەر یەکێک (کوردێتی) خۆی ئاشکرا بکات‌و بەرگری لە مافە نەتەوەیی‌و دیموکراتییەکانی کوردەکان بکات ئەوا چۆن ئازاری دەدرێت‌و زۆری لێدەکرێت. ئایا قسەکردن بە تورکی‌و گوێگرتن لە مۆسیقای تورکی‌و ژیان وەک تورکەکان‌و ناولێنانی مندالآن بە ناوی تورکی مرۆڤ دەکەنە نیونەتەوەیی؟ ئەگەر کار ئەوها بوایە خۆ گشت تورکەکان دەبوونە نیونەتەوەیی! لە ساڵی ١٩٧١ هاوڕێیەکی پاریزەری کوردم هەبوو دەیووت: (من نیونەتەوەییم، منالەکانم ناوی ـ چەنگیز، ئەسلان ـیان لێدەنیم.) هەڵبەتە ئەمەش بە ئارەزووی ئیمپریالیزمی تورکییە، چونکە لەبنبڕەتەوە وە بەپێی یاسا ناوە کوردییەکان یاساخ کراون.

ئەو کوردانەی کە کەسێتی خۆیان ناپارێزن‌و خۆیان ماندوو ناکەن لەپێناوی گۆڕینی باری زەحمەتی میللەتەکەیان کە گەیشتۆتە نزمترین رادده جا ئەوانە نەک هەر نیونەتەوەیی نین بەڵکو ناتوانن ببنە دیموکرات‌و شۆڕشگێڕی راستەقینەش، چونکە شۆڕشگێڕ ئەوکەسەیە کە دژیەکە کۆمەڵایەتییە بناخەییەکان دەبینێت‌و تێدەکۆشێت بۆ چارەسەرکردنیان. کەسێک کە دوور بێت لە ئێش‌و ئازاری میللەتەکەی ناتوانێت ببێتە شۆڕشگێڕێکی راستەقینە. کەسێک کە شتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای خۆی نەزانێت‌و هەوڵیش نەدات بۆچارەسەرکردنی تەنگ‌و چەڵمەکان‌و ئەرکی سەرشانی خۆی نەزانێت ئەوا ئەوکەسە زەحمەتە ببێتە شۆڕشگێڕێکی نەگۆڕ. ئەوکەسەی کە شۆڕشگێڕی میللەتەکەی خۆی نەبێت یارەدەدانی ئەو بۆ خەباتی دیموکراتی‌و ئازادیخوازی گەلانی‌تر سوودێکی ئەوتۆی نابێت.

نیونەتەوایەتی تەنیا لەسەر بناخەی یەکسانی گەلان لەگەڵ یەکتر

پێکدێت. کاتێ دەوڵەتێکی سۆشیالیستی پشتگیری گەلە زۆرلێکراوو داگیرکراوەکان بکات ئەمە بەکارێکی نێونەتەوەیی دادەنرێت. وە پێویستە لەسەریان بەکاری نێونەتەوەییانەی خۆیان ڕابن. ئەم پەیوەندییە نێونەتەوایەتییە قابیلی تێگەیشتنە، چونکە زۆر لە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان لەم وڵاتانە چارەسەر کراون. بەرگری کردن و پاڵپشتی کردن لە میللەتە داگیرکراوو زۆرلێکراوەکان ئەرکێکە پێویستە جێبەجێ بکرێت. هەرچی تایبەتە بە گەلە زۆر لێکراوەکان ئایا تا چ ڕادەیەک دەتوانن یارمەتی چینە کرێکارییەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان بدەن و ئایا ئەم یارمەتیدانە چ سوودێکی دەبێت بۆ چارەسەرکردنی تەنگ و چەڵمەکانی ئەوان؟ گەر گیروگرفتەکانی خۆیان واز لێبێنن و بایەخ بە گیروگرفت و مەسەلەکانی چینی کرێکاری وڵاتە پێشکەوتووەکان بدەن، ئایا ئەمە بە ڕاکردن لە مەسەلەی تایبەتی خۆیان ناژمێردرێت؟ ئایا ئەم کارە بە هاوکاری نێونەتەوەیی لەقەڵەم دەدرێت؟ لەباری ئێستادا لەتوانادا نییە یارمەتی کوردەکان بۆ کرێکارانی سۆڤیەت و ئەڵمانیاو ئینگلیزو کرێکارانی هیندستان و میسر پێک بهێنرێت... چونکە کوردەکان زۆرلێکراون و ئابڕوو کەرامەتی ماددی و مەعنەوییان لێ زەوت کراوە. بەڵام بە پێچەوانەوە پاڵپشتی کردنی چینی کرێکاری بۆ خەباتی نەتەوایەتی و دیموکراتی کوردەکان زۆر لە جێی خۆیدایە وە پێویستە ئەم کارە جێبەجێ بکرێت. پێویستە لەم چوارچێوەیەوە لە مەسەلەی (نێونەتەوایەتی) بکۆڵرێتەوە. بە بڕوای من پشتگیری کردنی نێونەتەوەیی پێویست ناگاتە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی شۆڕشگێڕی کورد. ئایا بۆ ئەم کارە ئەنجام نادرێت؟ هەندێکیان دەڵێن چونکە کوردەکان نێونەتەوەیی نین. بەڵام ئایا نێونەتەوەیی تەنیا ئەرک و کاری سەر شانی کوردەکانە؟ ئایا سۆڤیەت و چین و ئەلبانیاو بولگاریاو دەوڵەتانی وەک چیکۆسلۆڤاکیاو چینی

کرێکاری تورکی‌و فەرەنساو ژاپۆن‌و ئەوانی‌تر ئەرکی نێو نەتەوەییان لەسەر شان نییە؟ ئایا بۆچی ئەوان تائێستاش بێدەنگن؟ پێویستە کوردەکان لەم کارە ووردببنەوەو لێی بکۆڵنەوە. پێویستە لەسەر ئەو کوردانەی کە خۆیان بەنێونەتەوەیی ناودەبەن لە خۆیان پرسیار بکەن ئایا بۆچی وولاتە سۆشیالیستییەکان‌و چینە کرێکارییەکانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان هاریکاری‌و پشتگیری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردیان نەکردووەو چاویان لێ پۆشیوە؟ وە ئایا بۆچی یارمەتی دەوڵەتە زەوتکەرو داگیرکەرەکانی کوردستان ئەدەن‌و لایەنگرییان ئەکەن؟ هەڵبەتە پێویستە گەلانی داگیرکراو یارمەتی یەکتر بدەن‌و پەیوەندی خۆیان بەهێز بکەن. پێویستە بپرسرێ بۆچی رێکخراوەی رزگاریخوازی فەلەستین پشتگیری کوردەکان ناکات، لەکاتێکدا لایەنگری دەوڵەتە زۆرلێکەرەکانی کوردستان دەکات؟

سەرخۆبوون: زۆر سوپاستان دەکەین بۆ ئەم چاوپێکەوتنە بەنرخ‌و بەرەبەدارەو ئاواتمان سەرکەوتنتانە لە تێکۆشانتان‌و بەم بۆنەیەشەوە پەیامی دۆستایەتی گەلەکەمان بە ئێوە رادەگەنین.

بێشکچی: منیش زۆر سلاو لە شەرەکەرانی رێگای ئازادی‌و سەربەخۆیی کوردستان دەکەم‌و ئاواتم سەرکەوتنی پارتی‌و ئەرتێش‌و بەرەیە. شتێکی روونە کە PKK‌و ERNK‌و ARGK لە گۆڕان‌و پێشکەوتنی رامیاری‌و کۆمەلایەتی لە کوردستاندا رۆڵێکی مەزنیان هەبووە. سلاوو رێزو خۆشەویستی خۆم بۆ ئەو کەسانە دەنێرم کە جێگای خۆیان گرتووە لە دروستکردنی ئەم گۆڕانەدا. سلاویشم هەیە بۆ گەلی کوردو رۆڵەکانی کە بەشەرەفەوە شەڕ دەکەن لەپێناوی گەیاندنی گەلەکەیان بە مرۆڤایەتی هاوچەرخ. ئاواتی سەرکەوتن بۆ پارتیزانەکان‌و سەرۆک ئاپۆ دەخوازم. بەرێز لەبەردەم شەهیدانی ئەم رێگایە دەوەستم‌و بەتایبەتی هەزاران شۆڕشگێڕ کە کوردستانی نیشتمان دەپارێزن. من

زۆر سوپاسی ئێوه دەکەم کە ماوەی ئەوەتان پێدام تاکو بیروڕای خۆم دەربڕم و لە کۆتاییشدا چەند هیواو خۆزگەم هەنە کە دەمەوێ لە ڕێگای ئێوەوە ڕایان بگەیەنم.

وەک دەبینین لەم ساڵانەی دواییدا دۆستی کوردەکان بەرەو زیاد بوون دەچن. لەهەمان کاتیشدا ژمارەی شۆڕشگێڕان و دیموکراتیخوازان زیاد دەبن وە پاڵپشتی خەباتی کوردن لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی. ڕەوایی و ڕاستی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕوون دەبێتەوە. هەڵبەتە دوژمنانی کوردیش بێدەنگ نین. ئەوان خۆیان بە تەکنۆلۆژیای نوێ چەکدار دەکەن و هەموو شێوەو گەمەیەک دەگرنەبەر لەپێناوی ڕووخاندنی PKKو لە پەکخستنی کاریگەریەکەی، هەروەها هەزاران نەخشە دەکێشن لەپێناوی کوشتنی ئەمینداری گشتی پارتی عەبدوڵلا ئۆجالان. سیخوڕان دەنێرنە ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز. کەواتە لەم کاتەدا زۆر ئەرک و فرمانی مەزن دەکەونە سەرشانی پارتی و بەرەو ئەرتێش. PKK ئاگاداری ئەم ئەرکانەیە. نابێ کون و کەلەبەرێک لە ڕیزەکانی PKK بمێنێتەوە وە ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەتی سکرتاریەتی گشتی و سەرۆک ئاپۆ دەگرێتەوە. لەنێو هێزی ئاسایشی تورکی و ڕاگەیاندنی ئیمپریالیزمی قەناعەتێکی گەورە لە ئارادایە بەوەی کە مردنی عەبدوڵلا ئۆجالان واتا ڕووخان و کۆتایی PKK. وە هەتا ئەوەش دەوترێ بەڵێ بۆ PKK بەلاّم بێ عەبدوڵلا ئۆجالان. هەروەک لەسەرەتادا ووتیان ئەرێ بۆ مەسەلەی کوردی بەلاّم نەبۆ PKKو ئێستاش ڕا گۆڕاوەو بۆتە PKK قەبوڵ دەکەین بێ ئاپۆ.

بارودۆخ بەم شێوەیە نییە کە ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەکانی ئیمپریالیزم و بەڕێوەبردنی ئیمپریالیزمی تورکی بیری لێدەکەنەوە. ڕێکخراوەی PKK زۆر قووڵترو فراوانترە لە بیرکردنەوەیان. PKK سەرکردایەتی

بزووتنەوەی کوردو کەسێتی چینایەتی ئەم بزووتنەوەیەی گۆڕاند. PKK ئەو ڕێکخراوەیە نییە کە بسوڕێنرێتەوەو تەنیا کەسێک ڕێ نیشاندەری بێت. لە هەمووی گرنگتر لەمانەو بە پلەی یەکەم ئەوەیە کە PKKو ئاپۆ ئەم شتانە دەزانن‌و تەگبیری گونجاویان لەدەستدایە بۆ ئەم مەسەلانە. سەرەڕای ئەمەش دەبێ ژمارەی (ئاپۆ) زیندەتر بێت‌و بە دەیان‌و سەدانی وەک ئاپۆ بێنە مەیدانەوە. نابێ لەنێو PKKدا (کەسانێک هەبن جێگەیان پڕ نەکرێتەوە.) هەڵبەتە ئەمەش ڕاستە کە زیندەبوونی نموونەی وەک ئاپۆ شتێکی ئاسان نییە. کۆمەڵگا هەمیشە نموونەی وەک ئاپۆ ناخوڵقێنێت. هەندێک کات سەرۆک بەم شێوەیە دێنە ئاراوە. دروستکردنی نموونەی وەک ئاپۆ لە قوتابخانە یاخود بەهۆی پەروەردە کردنی ڕەسمی لەتوانادا نییە. لە چ بارێکدا کۆمەڵگا نموونەی وەک ئاپۆ دروست دەکات؟ پێویستە لەم مەسەلەیە بکۆڵرێتەوەو ئەمەش دەچێتە ناو چوارچێوەی فەلسەفەی مێژوو. هەرچەند دەزانم ئەم کارە ئاسان نییە بەڵام دووبارە دەڵێم: پێویستە نموونەی وەک ئاپۆ زیندە بکەین. پێویستە کۆشش بکرێت لەپێناوی دروستکردنی سەدەهای وەک ئەو. پێویستە هەر سەڵتێک وەک ئاپۆی لێ بێت.

لەڕاپۆرتی ئێزگەی بەریتانی‌و لە ڕێکەوتی نۆزدەی ئایار کاتژمێر سی‌و بیست دەقیقەو لە بەرنامەی هەواڵەکانی ڕاگەیاندنی تورکی بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی ڕێکەوتی بیست‌و یەکی ئایاردا هاتووە:

(ڕۆژنامەی میللییەت نووسیویەتی ـ جەنگی نێوخۆیی لە نێو PKK ـ لەژێر ئەم ناونیشانە ڕۆژنامەکە هەواڵێکی بڵاوکردۆتەوە بەوەی کە شەڕ لە سەربازگەی PKK لە ـ بقاع ـ قەوماوەو لەکاتی شەڕیشدا ئاپۆ کوژراوە. سەربازگەش سەرەو ژێر بووەو تورکیا بە پەرۆشەوە ئەم بابەتە بەسەردەکاتەوە.) هەواڵی لەم جۆرانە نە بەتەنێ لەنێو پارتیزانە کوردەکان بەڵکو لەنێو ملیۆنەها کورد دەبێتە هۆی

بلاوکردنەوەی ناخۆشیو ناڕەحەتیەکی سەخت. هەر لەبەر ئەوە بوو ئێزگەی بەریتانی BBC لە ڕۆژی دوایی‌دا هەواڵەکەی بەدرۆخستەوەو داوای لێبوردنیشی لە گوێگران کرد. هەر هەمان هەواڵی بەدرۆخراوە لە ڕۆژنامەی جمهوریەتو ڕۆژنامەکانی‌تریشدا بلاوبۆوەو ئەوانیش داوای لێبوردنیان لە خوێنەرانیان کرد، گۆڤاری حوریەت لە بیستو هەشتی ئایار ڕەخنەی لە ئێزگەی بەریتانی گرت چونکە هەواڵەکەی بە درۆخستبۆوە. سەرچاوەی ئەم هەواڵەش لە بنچینەدا گۆڤاری مانگانەی سەرخۆبوون ژمارە:٩ی ئازاری ١٩٩٠ بوو. ڕاگەیاندنی ئیمپریالیزمی زۆر بە فێڵو لێزانیی‌یەوە یاری بەم هەواڵانە دەکات. زیندەڕۆیی کردن لە بابەتەکانو قۆستنەوەی هەواڵەکانو چاندنی ترس لەنێو گەلی کورددا بە ئەرکی ڕاگەیاندنی تورکی دەژمێردرێت. لە بیستو شەشی ئایار ڕۆژنامەی (گونەش) چۆنیەتی بلاوکردنەوەی هەواڵەکەی (میللییەت)ی باسکردبوو و وای نیشاندابوو کە هەواڵەکە گاڵتەو درۆ بووە. وە بەبێ پرسیارکردن لە ڕاستی هەواڵەکە ڕۆژنامەی (میللییەت) ڕۆژنامەی ڕەسمی دەوڵەت هەواڵەکەی بلاوکردۆتەوە. سەرەڕای ئەوەش ڕۆژنامەی (تەرجومان) هەمان هەواڵو درۆی بلاوکردەوە بەلام پاش ڕازاندنەوەی لە بیستو شەشی ئایار:

(میلیشیا سەریان بەرز کردەوە لە بەرامبەر ئاپۆ: بیست کوژراو.) هەواڵەکە بەم شێوەی سەرەوە بوو. وەک ئاشکرایە ڕاگەیاندنی ئیمپریالیزمی ئارەزووی خۆیان بلاودەکەنەوە نەک ڕاستییەکان. لە بیستو شەشی ئایار هەواڵێک لە ڕۆژنامەی (حوریەت) لەژێر ناوی (هەڕەشەی PKK)دا بلاوکرابۆوە وە لەم هەواڵەدا ڕوون دەبێتەوە کە PKK تا چ ڕادەیەک دەستەودایەرەی تورکی ترساندووە. هەواڵەکەش بە کورتی بەم شێوەیە: (یەکێ لە پاسەوانەکان لە گەڕەکێکی شاری -

ئەدەرنە*ـ بڵاوكراوەیەكی پاشكۆی رۆژنامەی (حوریەت)ی چاو پێدەكەوێتو لە بڵاوكراوەكەدا لەسەر PKK شت نووسراوە. ئەم پاسەوانە وا بڕوا دەكات كە ئەم بڵاوكراوەیە لە بڵاوكراوەكانی PKK خۆیەتیو دەچێ ئەم بڵاوكراوەیە دەباتە بنكەی پۆلیسو دەیدا بەوان. پاشان پۆلیس بەهەڵە دەكەونە خۆكۆكردنەوەو خۆ ئامادەكردن. بڵاوكردنەوەی بڵاوكراوەكانی PKK هەتا لە (ئەدەرنە)ش ترس دەخەنە گیانی پۆلیسەوە. دوای ئەوەی كە دەزانن ئەم پەڕە كاغەزە بڵاوكراوەی PKK نییە بەڵكو پاشكۆی (حوریەت)ـە شادومان دەبنو گیانیان دێتەوە بەر. لێرەدا مرازی دوژمن بەرامبەر بە PKKو سەرۆك ئاپۆ روونو ئاشكرا دەبێت. لەبەر ئەوە پێویستە خۆ بۆ هەر كارێك ئامادە بكرێت. هیچ شتێك نەماوە كە دوژمن دژی PKKو سەرۆك ئاپۆ بیری لێ نەكردبێتەوە. لەدەستی دێ داهاتی ساڵێكی تەواو بۆ ئەم كارە تەرخان كات. وە چاكترین بەرەنگاربوونەوەی ئەم دوژمنكارییەش ئەوەیە كە هەركەسێك خەبات بكات بۆ ئەوەی ببێتە ئاپۆ...

سڵاو بۆ گشت (ئاپۆ)كان.

ئالفتا: ٢٩/١١/١٩٩٠

* شارێكی توركیایە نزیك بە یۆنانستانو بولگارستانە.

